ناوی کتێب: لە سکالاوە بەرەو سوپاسگوزاری

بابەت: هاندان

ئامادەکار: هاوناز م. ئیبراهیم

تایپ: ئامادەکار

دیزاین: هەرێم عوسمان

قەبارەی کتێب: ١٣سم*٢١سم

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢٢ز

لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٣٨١) ی ساڵی ٢٠٢٢ ی پێدراوە

کتێبخانەی **گۆڵدن بووک**
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
**07701598762 - 07501444434**
Goldenbook ktebfroshe_warzer
Golden book · ktebfroshe_warzer
Warzer_Book · Ktebfroshe_warzer

## بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

دروود وسەلام برژێت بەسەر پێشەواو سەروەری مرۆڤایەتی هەتا رۆژی کۆتایی، ئەم کتێبەی لەبەردەستان دایە، دەربارەی دۆزینەوەی (خود) و خۆشویستنی خود و سوپاسگوزارییە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە لە ژیانماندا بوونی هەیە بە باش و بە خراپ، پێکهاتووە لە وتە و ئامۆژگاری و هاندان بەشێک لە قورئان و فەرموودە و وتەی ئەو کەساياتيانەی کە جێ پەنجەی خۆیان جێهێشتووە لەسەر ئەم دونیایە و جیاوازیان دروستکردوە و دەکرێت دروستی بکەن لە کەسایەتی و شێوازی بیرکردنەوە و ژیانی هەر تاکێک لە ئێمە.

تەنانەت دەکرێت ئێمەش یەکێک بین لەو کەسانە رۆژێک لە ڕۆژان، ئەگەر بێتو سەرەتا ئێمە خودی خۆمان بدۆزینەوە و بزانین کە چیمان دەوێت لە ژیان. بزانین کە

ئێمە جێنشینین و بە هۆکار هاتووینەتە سەر ئەم دونیایە بۆ ئەوەی جیاوازی دروست بکەین لە ژیانی خۆمان و کەسانی چواردەورمان.

پێویستە بزانین کە هیچ شتێک لەم ژیانەدا بێ هودەو ئامانج نە هاتۆتە بوون، هەموو شتێک بە هۆکارێک هاتۆتە بوون، چ جای مرۆڤ بەو هەموو شکۆ و مەزنیەوە کە خودا ڕۆحی جوانی خۆی بەبەرداکردوە.

پێویستە فێربین چێژ لە هەموو ساتەکانی ژیانمان وەربگرین و کاتەکانمان ڕێکبخەین و بەکاری بهێنین لە شتانێکدا کە سوودی هەردوو دونیامانی تێدابێت.

داوا دەکەم لە خوا وەکو چۆن وشەکانی ناو ئەو کتێبە جیاوازی لە ژیانی من دروستکرد و ئاسودەیم دۆزیەوە، بەم شێوەیەش هەر یەکێک لە ئێوەی ئازیز بیدۆزێتەوە، ئامانجی من لە وەرگێڕان و ئامادەکردنی ئەو کتێبە دۆزینەوەی ئەو گەنجینە بە نرخەیە کە من تیایدا دۆزیومەتەوە، پشت بە خوا ئێوەش بتوانن بیدۆزنەوە...

لەکۆتایدا تکام وایە با ئیتر وازبێنین لە سکاڵا دەربارەی ئەو شتانەی کە نیمانە، لە کاتێکدا ئێمە حیکمەتەکەی نازانین، با سوپاسگوزاربین بۆ هەموو ئەو شتانەی کە خودا پێی بەخشیوین و پێمان دەبەخشێت، با خۆمان خۆشبووێت

ئێمە ڕێزدارترین دروستکراوی خوداین و دڵخۆشبین بە هەموو ئەوشتانەی کە هەمانە، هەموو هەوڵی خۆشمان بدەین بۆ بەدەستهێنانی هەموو ئەوشتانەی کە دەمانەوێت بەدەستیبهێنین و سود و خێری هەر دوو دونیامانی تێدایە...

وەکو گاندی دەڵێت؛

هەموو هەوڵێکی خۆتبدە وەک ئەوەی هەتا هەتایە بژیت، بەجۆرێک بژی وەک ئەوەی سبەی کۆتا ڕۆژی ژیانت بێت.

ئەگەر هاتوو نەماین یاخود هەواڵمان نەما، لەهەر کاتێکدا بێت ئەوە ڕاسپاردەبێت نزاکردن لە نێوانمان !




Description

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون " ئاڤان بەهجەت " کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

# (تکایە خۆتت خۆشبوێت..!)

{١}

کاتێک خودی خۆتت خۆشناوێت،
ژیان کەسانێکت پێدەدات کە تۆیان خۆشناوێت.
بۆ ئەوەی بیرتبخاتەوە کە پێویستە سەرەتا خودی خۆتت خۆشبووێت!

***

{٢}

دەست بکە بە خۆشویستنی خۆت و
هەرگیز مەوەستە لە خۆشویستنی خۆت..!

***

{٣}

کاتێک تۆ دەست دەکەیت بە خۆشویستنی خۆت، لەوەتێدەگەیت کە بۆچوون و بیرکردنەوەی ئەوانی تر هیچ گرنگ نیە...!

***

{٤}

ڕێز لەو کەسانە بگرە کە ڕقیان لێتە،
چونکە ئەوان ئەو کەسانەن کە پێیان وایە تۆ لە ئەوان باشتری...!

***

## (تۆشایەنی خۆشەویستیت...)

{٥}

جیهان پڕە لەو کەسانەی کە تۆیان خۆشدەوێت، دڵنیابەوە لەوەی یەکێک لەو کەسانە خۆتبی...!

***

{٦}

هەمیشە کەسانێک بوونیان هەیە کە پێیان وایە تۆ بە ئەندازەی پێویست باش نیت،
نەکەی خۆت یەکێک بیت لەو کەسانە..!

***

{٧}

تاکە کەسێک کە پێویستە باشتربی لێی،
ئەو کەسەش دوێنێی تۆیە!

***

{٨}

تۆ دەتوانیت لە هەمان کاتدا هەردووکیانت خۆشبوێت.
ئەو کەسەی کە هەیت،
ئەو کەسەی کە دەتەوێت ببیت،
هەردووکیان شایەنی خۆشویستنن...!

***

{٩}

ژیانێکی بەختەوەر بە هۆی گەشتکردن، کارکردن، یاخود پەیوەندیەکانەوە بەدەست نایەت، بەڵکو زۆر بەسادەی بەبڕیاردان بەوەی کە بەختەوەربیت...!

***

{١٠}

دەست بە بەختەوەریتەوە بگرە.

هەرگیز بەرپرسیاریەتی مەدەرە دەست کەسانی تر...!

***

{١١}

ڕۆژێک لە ڕۆژان، لە شوێنێک، لەهەر شوێنێک، تۆ خۆت دەدۆزیتەوە، ئەوە تەنها ئەوە، دەکرێت ببێت بە بەختەوەرترین یاخود تاڵترین ساتی ژیانت...!

"پابلۆ نێرودە"

***

# (هەڵبژاردن لەدەستی تۆدایە!)

{١٢}

پێویستە لەوە تێبگەیت کە هەمیشە زیاتر لە یەک ڕێگا هەیە، بۆ گەیشتن بەسەر لوتکەی چیاکان!

***

{١٣}

تۆ هەر ئەوەیت کە باوەڕت وایە کە هەی!
دەبیت بەو کەسەی کە پێتوایە دەتوانی ببیت!

"باگاڤاد گیتە"

***

{١٤}

بیرکردنەوەکانی ناو مێشکت ڕاستەوخۆ کاریگەری دەخەنە سەر جیهانی دەرەوەت، بۆیە بیر لە باشترین هەستەکانت بکەوە،
هەموو جوانی و باشیەکان بخە مێشکتەوە!

***

## (ئەوەی لە تواناتدایە ئەنجامی بدە!)

{١٥}

هەر کە شەو تاریک داهات،
هەموو خەمەکانت وەلانێ.
بەهێمنی و ئارامیەوە بخەوە و
بزانە کە هەموو شتێک کە توانیوتە بۆ ئەمڕۆ کردوتە!
"ڕۆلد دال"

***

{١٦}

ئەگەر بەتەنها یەک شتی باش ڕوویدا لە نێوان سەدان شتی خراپ، ئەوا تۆ تیشک بخەرە سەر یەک شتە باشەکە!

***

{١٧}

من ئیتر کۆڵمدا لە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی کەسێک کە منی خۆشبووێت،
لە جیاتی ئەوە خۆم بووم بەو کەسە!
"ڕودی فرانسیسکۆ"

***

## (کارێک بکە داهاتوو سوپاسگوزارت بێت!)

{١٨}

باشتر وایە شتێک بکەی بە ناتەواوی،
لە جیاتی نەکردنی هیچ شتێک بەبێ هەڵە!

"ڕۆبێرت ه.سکوڵەر"

***

{١٩}

هەرگیز ئەوە مەکە بە خوو،
هەڵبژاردنی ئەوەی کە باش دیارە بۆت بەسەر ئەوەی کە بەڕاستی زۆر باشە بۆت!

"ئێریک تۆماس"

***

{٢٠}

داهاتوو بونیاد دەنرێت،
بە کارکردن لە ئەمڕۆدا نەک سبەی...!

"ڕۆبێرت کیۆسۆکی"

***

## (تۆ دەتوانیت!)

{٢١}

هەندێ لە خەڵکی دەیانەوێت ئەو شتەی کە دڵخۆشیان دەکات ڕووبدات،
هەندێکیان هیوا دەخوازن کە ڕووبدات،
بەڵام ئەوانی تر وادەکەن کە ڕوبدات...!

"میشێل جۆردان"

***

{٢٢}

تۆ دەتوانیت کەسێکی بەهێز و سەرکەوتووبیت،
لە هەمانکاتدا میهرەبانیش بیت!

***

{٢٣}

دڵنیابە لە ناو مێشکتدا، لە یەک ساتدا نیگەرانی و متمانە کۆنابێتەوە،
بۆیە پێویستە بڕیاربدەی یەکێکیان هەڵبژێریت!

***

## (ئافرەت واتە جوانی و هێز..!)

{٢٤}

ئافرەتان جوانی و ڕازاوەی پیاوانن، تەنها کەسێک ڕێزیان لێدەگرێت کە بەخشندەبێت،تەنها کەسێک ڕێزیان لێناگرێت کە دڵڕەق و نابەخشندە بێت...

***

{٢٥}

ئافرەتی بەهێز ئازارەکانی وەکو شمشێرێکی بچووک لەبەردەکات، گرنگ نیە چەندە بە ئازارە، هەمیشە ئەوەی لێوەی دەبینیت جوانییە...!

***

{٢٦}

ئافرەت وەکو "تورەکەی چا "وایە ناتوانیت بڵێیت کە چەندە بەهێزە،هەتاوەکو نەیخەیتە ناو ئاوی گەرمەوە...!

***

## (براوەکێیـــە)

{٢٧}

براوەکان هەمیشە براوە نین لە ژیاندا،
بەڵکو تەنها ئەوەیە کە کۆڵنادەن!

***

{٢٨}

ئەگەر حەزت بەشتێک نەکرد لە ژیانت هەوڵبدە بیگۆڕیت، ئەگەر نەتتوانی، ئـەوا هەوڵبدە شـێوازی بیرکردنەوەت بگۆڕیت دەربارەی!

***

{٢٩}

سەرکەوتن هەموو کاتێک بە بردنەوە بەدەست نایەت،
بەڵکو سەرکەوتنی ڕاستەقینە لە دوای هەڵسانەوە لە شکست و کەوتن دێت!

***

{٣٠}

کاتێک ژیان شتێکی زیاد نادات بەتۆ،
هۆکارەکەی ئەوەیە کە تۆ شتێکی زۆرت ناوێت لەو..!

***

{٣١}

هەندێ جار ژیان لە هەمان کاتدا هەستی دڵ ڕەقانە و کۆمیدی هەیە، ئەمەش لەو کاتەدایە ئەوشتەی کە تۆ دەمێکە ویستوتە، لە خراپترین و بێ هیواترین ساتدا پێت دەدات!

***

{٣٢}

ئێمە لە ژیاندا بە چەندین ئازاردا دەڕۆین،
بەڵام چۆنیەتی کاردانەوەی ئێمە بۆ ئەو ئازارانە،
بە دڵنیاییەوە هەڵبژاردن لەدەستی ئێمەیە!

***

## (هەرگیز...!)

{٣٣}

هەگیز بێ ئومێد مەبە لەو خودایەی کە بۆ جوان بـــوونی گوڵێـــک، ئاسمان دەهێنێتـــە گریان...!

***

{٣٤}

هەرگیز هیچ شتێک ئاسانتر نابێت،
بەڵکوو ئەوە تۆیت کە باشتر دەبیت!

***

{٣٥}

هەرگیز مە جەنگە بۆ کەمتر لەو شتەی کە دەزانی شایەنتە!

***

## هەمیشە گومانی باش ببە بە خودا!

{٣٦}

خوامان بەسە کە یار و یاوەرمان بێت بۆ ئەو کەسانەی کە شتانێکیان دەربارەمان گووت کە لە ئێمەدا بوونی نەبوو...!

***

{٣٧}

ئەوەی بیرت بۆی ناچێت خودا پێتی دەبەخشێت، ئەوەشت لەبیر دەباتەوە کە پێت وابووە تێناپەڕێت...!

***

{٣٨}

هەموو تاقیکردنەوەیەکی خودا سزا نیە، بەڵکوو هەندێکی لە میهرەبانی خودایە دەیەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای ...!

***

{٣٩}

ئاسایی بوون ڕێگایەکی قیرتاو کراوە، ڕۆشتن پیایدا خۆشی و ئاسودەییە، بەڵام لە ڕێگای قیرتاوکراودا هیچ گوڵێک سەردەرناهێنێت!

"ڤان کوخ"

***

{٤٠}

تۆ ڕووبەڕوی شکانی زۆر شت دەبیتەوە لە ژیاندا، بەڵام هەرگیز ڕێگە مەدە خۆت بشکێیت!

"مایە ئەنجێلۆ"

***

{٤١}

لەوانەیە وا پێویست بکات کە ئەوە ون بکەیت کە تۆ کێ بویت؟ بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە تۆ کێیت...!

***

## (با لەگەڵ یەکتر پێبکەنین نەک بەیەکتر!)

{٤٢}

لەوانەیە ئازارەکانم ببێتە هۆکاری پێکەنینی کەسێک، بەڵام هەرگیز ڕێگە نادەم پێکەنینم ببێتە هۆکاری ئازاردانی کەسێک!

"چارلی چاپن"

***

{٤٣}

بە کوژاندنەوەی مۆمی کەسانی تر دڵنیابە مۆمی تۆ گەشاوەتر نابێت!

***

## (تۆکێیت؟)

{٤٤}

من ئەوەم کە هەم،

نەزیاتر،

نەکەمتر،

ئەوەش بەسە!

"هارپریت م.دایال"

***

{٤٥}

هەندێ جار دەبیتە براوە،

هەندێجاریش فێردەبیت!

***

{٤٦}

ناتوانیت ئەو شتانە بگۆڕیت کە پێشتر ئەنجامتداوە، بەڵام دەتوانیت ئەوشتانە بگۆڕیت کە دواتر ئەنجامیان ئەدەیت...!

***

## (کۆیلەمەبە!)

{٤٧}

کۆیلەمەبە! تا شوێنێک کۆمەڵگە پەیڕەوبکە کە هەست دەکەی پێویستە، بەڵام هەمیشە حاکمی چارەنووسی خۆتبە..!

***

{٤٨}

هەر چەندە زۆرتر تۆ خودی خۆت بناسیت و بزانیت چیت دەوێت، ئەوا کەمتر ڕێگا بە شتەکان دەدەیت کە خەمبارت بکەن...!

"ستیڤانیە پێرکینس"

***

{٤٩}

پێویستە فێربیت ئەو مێزە جێبهێڵیت،
کە خۆشەویستی تیایدا پێشکەش ناکرێت...!

***

## (ئەگەر دەتەوێت)

{٥٠}

ئەگەر دەتەوێت ئازاکان ببینیت،
سەیری ئەوانەبکە کە خۆشەویستی دەبەخشن لەبەرامبەر ڕق و کینە.
ئەگەر دەتەوێت قارەمانەکان ببینیت سەیری ئەوانە بکە کە دەتوانن لێخۆشبوو لێبووردەبن!

"باگاڤاد گیتا"

***

{٥١}

ئەگەر دەتەوێت بە عیشقەوە بژیت، پێویستە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دابەشی بکەیت!

***

{٥٢}

ئەگەر ئەو شتەی کە دەیکەیت دڵخۆشی کردی،
ئەوابزانە کە کاتت بەفیڕۆ نەداوە...!

***

## (خۆت قبوڵ بکە...)

{٥٣}

بۆماوەی چەندین ساڵ ڕەخنەت لە خۆت گرت،
بەڵام هیچ کاریگەری نەبوو.
هەوڵبدە کە خۆت قبووڵبکەیت ئینجا سەیرکە بزانە چی ڕوودەدات!

***

{٥٤}

ئێمە هەمووومان هەڵبژاردن دەکەین، بەڵام لە کۆتایدا ئەوە هەڵبژاردنەکانن کە ئێمە دروست دەکەن!

***

# (هەڵەبکەو فێربە!)

{٥٥}

پێویستە چی بکرێت لەگەڵ هەڵەیەک:
دەیناسینەوە،
دانی پێدائەنێین،
لێیەوە فێردەبین،
لەبیری دەکەین!

"دێن سمیز"

***

{٥٦}

ئەگەر هیچ هەوڵێک نەبێت،
هیچ پێشکەوتنێک نابێت!

***

{٥٧}

زۆرجار هەڵبژاردنە هەڵەکان،
ئێمە دەبەن بەرەو شوێنە راستەکە!

***

## (بەختەوەربوون هونەرە!)

{٥٨}

فێربە کە بەردەوام شادومان بیت،
چونکە لە شادمانیدایە کە لە خودا نزیکتر دەبین!

***

{٥٩}

دەکرێت بەختەوەری بەدەست بهێنیت تەنانەت لە تاریکترین ساتەکاندا، ئەگەر بێت و یەکێک بیریبێت کە ڕووناکیەکە داگیرسێنێت..!

***

{٦٠}

هەرگیز شەرم مەکە لە ئەنجامدانی ئەوشتەی کە لەڕادەبەدەر تۆ دڵخۆش دەکات...

***

## (تەنها خۆت دەتوانیت)

{٦١}

دڵنیابە تەنها خۆتی کە دەتوانی ئەو ژیانە بونیادبنێیت کە شایەنتە!

***

{٦٢}

هەرچەندە ژیانت خراپ دەربکەوێت،
هەمیشە شتێک هەیە کە دەتوانی ئەنجامی بدەی و
تیایدا سەرکەوتوبیت.
لەکاتێکدا ژیان هەیە، هیواش هەیە...!

***

{٦٣}

تۆ ڕێگەت پێدراوە کە کاتی خۆت وەربگریت بۆ گەشەکردنت
بە شێوازە جوانەکەی خۆت....!

***

## (خەون و ئامانجەکانت بەجدی وەربگرە!)

{٦٤}

ڕێگە مەدە ژیان ئامانجەکەت بگۆڕێت،

چونکە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە لەوانەیە ژیانت بگۆڕێت!

***

{٦٥}

لە خەونەکان و خۆشەویستیدا،

شتێک نییە بە ناوی مەحاڵ...!

***

{٦٦}

خەونەکانت بەجدی وەربگرە!

***

# (ئاساییە ئەگەر بترسیت!)

{٦٧}

زۆر ئاساییە ئەگەر بترسیت.
چونکە ئەو ترسە مانای وایە کە تۆ خەریکی ئەنجامدانی کارێکی بەڕاستی ئازایانەیت!

❋❋❋

{٦٨}

کاتێک ترس لەدەرگا دەدات،
ڕێگە بدە متمانە دەرگا بکاتەوە!

"ڕۆبین ڕۆبێرت"

❋❋❋

{٦٩}

کاتێک جیهان دەڵێت؛ کۆڵبدە،
هیوا دەچرپێنێت، جارێکی تر هەوڵبدە.

❋❋❋

# (لەبیرت بێت!)

{٧٠}

هەموو شەوێک بۆخۆتانی بخوێننەوە:
من مرۆڤێکی بەئومێد و گەشبینم،
هیچ ڕق و کین و ئیرەیەکم بەرامبەر هیچ کەس نیە، ترس و دودڵی لە خۆم دووردەخەمەوە و شوێنی دەدەم بە بڕوابەخۆبوون و هیوا!

***

{٧١}

هۆکاری شەرمنی،
بیرکردنەوەی هەڵەیە،
تکایە خۆتان بە کەم مەزانن!

***

{٧٢}

هەرگیزاو هەرگیز درەنگ نییە،
بۆ هەوڵدان و بە دیهێنانی خەونەکانت!

***

## (هەر ئێستا دەست پێبکە!)

{٧٣}

یەکەم؛ پێویستە سەرت بەرزبکەیتەوە سەیری ئەستێرەکان بکەیت نەک پێیەکانت.

دووەم،هەرگیز کۆڵمەدە لە کارکرن، کار ماناو مەبەستت پێدەدات، ژیان بەبێ کارکردن بێ ماناو بەتاڵیە.

سێیەم، ئەگەر تۆ ئەو چانسەت هەبوو کە خۆشەویستی راستەقینە بدۆزیتەوە، لەبیرت بێت و هەرگیز پشت گوێی مەخە!

"ستیڤن هاوکینگ"

❁❁❁

{٧٤}

هەڵەکانی رابردوو لەبیرکە، شکستەکان لەبیرکە، هەموو شتێک لەبیرکە جگە لەو شتەی کە دەتەوێت ئێستا ئەنجامی بدەیت . دەست پێبکە!!

"ولیام دورات"

❁❁❁

{٧٥}

هەرگیز هەوڵمەدە بۆ ئەوەی وابکەی خەڵکی خۆشیان بوێیت،
لە ڕاستیدا هیچ گرنگن نیە ئەگەر خەڵکی تۆیان بەدڵبێت یا نا.
ببە بە باشترینی خۆت،
بەمە سەرنجی باشترین خەڵک ڕادەکێشیت بۆ خۆت.
ئەوە هێزی ڕاستگۆییە!

"ئید لاتیمۆر"

***

## (سوپاسگوزاری بەخششەکانی خودا بە!)

{٧٦}

(تەماشای لەخۆتان خوارتر بکەن و تەماشای لە خۆتان بەرزتر مەکەن، ئەمە شیاوترە بۆ ئەوەی بەبێڕێزی سەیری نیعمەتەکانی خودا نەکەن).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

{٧٧}

خودای گەورە دەرگایەک لەسەر بەندەکەی خۆی داناخات بە حیکمەتەوە نەبێت ئیلا دوو دەرگای بە ڕەحمەتەوە بەڕوودا دەکاتەوە.

"ابن القيم"

***

{٧٨}

هەرکات چێژ و لەزەتت لە عیبادەت نەکرد،
ئەوە بزانە ئەوە عیبادەت نییە!

***

## (گرنگی پێدان خۆشەویستییە!)

{٧٩}

دەڵێن بۆ ئەوەی کەسێک دڵخۆشبێت لە ژیانیدا، پێویستی بەم سێ شتەیە: کەسێک کە خۆشیبوێت، کارێک هەبێت کە ئەنجامی بدات، شتێک کە هیوای پێبدات!

"تۆم بۆدیت"

***

{٨٠}

دلسۆزی وادەکات کە متمانەمان هەبێت،
متمانە وادەکات کە بمێنینەوە،
مانەوە وا دەکات خۆشمان بوێن،
خۆشەویستی وادەکات هیوامان هەبێت..!

"گلێن ڤان دێکن"

***

{٨٢}

ماڵئاوایەکی سادە دەتوانێت ئێمە بخاتە گریان،
گاڵتەیەکی سادە دەتوانێت ئێمە بخاتە پێکەنین، وە گرنگی پێدانێکی سادە دەتوانێت ئێمە بخاتە خۆشەویستیەوە!

***

## (هەر بەڕاست تۆ کێیت؟)

{٨٣}

هەرگیز لە وەڵامدانەوە دەستەوەسان نەبووم، مەگەر لە ئاست کەسێک کە لە منی پرسیبێت: تۆ کێیت؟

"جبران خلیل جبران"

***

{٨٤}

دوو تایبەترین ڕۆژەکانی ژیانت،

ئەو ڕۆژەی کە لە دایکبوویت،

ئەو ڕۆژەی کە دەزانی بۆچی لە دایکبوویت!

"مارک توەین"

***

{٨٥}

لە بیرت بێت کە خۆشویستنـــی خۆت، خۆبەگـــورەزانی و خۆپەرســـتی نییە!

***

## (ئاگاداربە!)

{٨٦}

بوەستە!

هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژە.

ناتوانیت ئەوە بگەڕێنیتەوە کە وتوتە، هەر بۆیە دڵنیابەرەوە کە شتێک نەبێت دواتر پەشیمان بیت!

***

{٨٧}

ئەو شتانە لەناو مێشکدا بهێڵەوە کە دەتەوێت ڕووبدات، نەک ئەوشتانەی کە ناتەوێت ڕووبدات!

***

{٨٨}

باشتر وایە کە دەمت بەداخراوی بهێڵیتەوە و خەڵکی پێیان وابێت کە گەمژەی، لە جیاتی ئەوەی دەمت بکەیتەوەو هەموو گومانەکانیان پشتڕاست بکەیتەوە!

"مارک توین"

***

## (نیگەرانی چیت؟)

{٨٩}

ئەمڕۆ ئەو سبەینێیە کە دوێنێ نیگەرانی بووین!

***

{٩٠}

هەرشتێک کە بڕیاربێت ڕووبدات،
ڕوودەدات.
جا ئەگەر ئێمە نیگەرانبین یاخود نا.

" ئانا مۆنار"

***

{٩١}

لەوانەیە هەموو ڕۆژەکانت باش تێنەپەڕێت، بەڵام هەمیشە شتێکی باش ڕوودەدات لە هەموو ڕۆژەکان.

***

# چۆن ببین بە کەسێکی براوە!

{٩٢}

ئێمە بۆ ئەوە هاتوینە بوون هەتاوەکو براوەبین،
بەڵام بۆ ئەوەی ببیت بە براوە،
پێویستە پلانت هەبێت بۆ بردنەوە،
ئامادەکاری بکەیت بۆ بردنەوە،
چاوەڕێی بردنەوە بین!

***

{٩٣}

لەهەر کوێوە دەست پێدەکەیت دەست پێبکە.
ئەوەی دەتوانی ئەنجامی بدە.
هەرگیز مەوەستە. بەردەوامبە!

***

{٩٤}

لەوانەیە واپێویست بکات کە زیاتر لە جارێک بجەنگیت بۆ ئەوەی کە براوەبیت!

"مارگارێت زاچە"

***

# (بڕوات بە خۆت بێت!)

{٩٥}

بە سەختی کارکردن زۆر گرنگە،
بەڵام شتێک هەیە کە زۆر گرنگترە:
ئەویش "بڕوا بە خۆبوونە"
"هاری پۆتەر"

***

{٩٦}

دەست بکە بە وتنی "بەڵێ" بۆ ئەوشتانەی ترست هەیە دەربارەیان،
دواتر سەیرکە کە ژیانت چۆن گۆڕانکاری بەسەردادێت!

***

{٩٧}

بۆ ئەوەی سەرکەوتووبیت پێویستە هەموو ئەو گۆڕانکاریانە قبوڵکەیت کە دێنە ڕێگەتەوە، تۆ ناتوانیت تەنیا ئەوانە قبوڵکەیت کە پێتخۆشە!
"میکی گافکا"

***

{٩٨}

بەدڵێکی پاکەوە هەموو کارێکی باش ئەنجام بدە، چاوەڕوانی هیچ پاداشتێک مەکە لەبەرامبەردا، بەو جۆرە هەرگیز نائومێد نابیت!

***

{٩٩}

بەجۆرێک سەرقاڵی سەلماندنی مەزنی خۆتبە، کە هیچ کاتت نەبێت بۆ ڕەخنەگرتن لە کەسانی تر!

***

{١٠٠}

ئاگایی لە مردن ڕێگە نادات ئەوەی پێویست ئەمڕۆ چێژی لێوەرگرین بیخەینە سبەینێ!

***

{١٠١}

ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ (الأعراف: ٥٥)

واتـە: دوعـاو نـزا لـەپـەروەردگـارتـان بکەن بە زەلیلی (و کڕوزانەوە) و بە نهێنی بێگومان خوا دەست درێژیکارانی خۆش ناوێ.

***

{١٠٢}

لە خودا نزیک بەرەوە،
دڵنیابە خوداش لە تۆ نزیک دەبێتەوە.

(جەیمس)

***

## (ئەوەی کە قەدەر دەگۆڕێت!)

{١٠٣}

ئەگەر تاقیکردنەوە قورسەکان نەبوایە لە ژیانماندا،
زۆرێک لە ئێمە فێری نزاکردن نەدەبووین!

"ئامینتا کوت"

***

{١٠٤}

ئەگەر نیگەرانی شتێکیت نزای بۆ بکە،
ئەگەر نزات کرد چیتر نیگەران مەبە،
چونکە تۆ سپاردوتە بە خودا...!

***

{١٠٥}

مەحاڵەکان،
زۆرتر ئەوشتانەن کە هەرگیز هیچ هەوڵێکیان بۆ نەدراوە!

***

## (باوەردار خەمی لەناو دڵی دایە!)

{١٠٦}

(باوەردار خەمی لەناو دڵیدایەو شادومانیش لە رووخساری)
"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

***

{١٠٧}

شادمان بوون هونەرە،
شادومانکردن هونەرێکی باڵاتر،
بەڵام بێ خەمی نەنگیەکی گەورەیە لە ئێمە دووربێت!
"ئەبو سەعید ئەبولخەیر"

***

{١٠٨}

خۆشەویستی قەدەرە ڕاستیەکەی ئێمەیە،
ئێمە ناتوانین مانای ژیان بەتەنیایی بدۆزینەوە . بەڵکو ئێمە
بە هاوبەشی لەگەڵ کەسانی تر ئەوە دەدۆزینەوە!

***

{١٠٩}

مَن جَاءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَىٰٓ إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ (الأنعام: ١٦٠)

واتە: هەر کەسێک چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دوایی دا) دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە وە هەر کەسێک خراپە بکات ئەوە تۆڵەی لێ ناسێنرێ تەنها بەوێنەی خۆی نەبێ و ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ.

***

## (خەونەکانت دەبێت بە ڕاستی!)

{١١٠}

خەونەکانت دەکاتە ڕاستی!
کێ ؟
ئەو خودایەی بۆ پێکەنینی گوڵێک
ئاسمان ئەخاتە گریان ...

"مەولانای ڕۆمی"

***

{١١١}

خەونەکان بەهۆی جادووە نابن بەڕاستی و بەدینایەن، بەڵکوی پێویستیان بە ئارەق ڕشتن و نەخشەدانان و کارکردنی قورس هەیە!

"کۆڵین پۆوێڵ"

***

## میهرەبان بە!

{١١٢}

(موسڵمانی-تەواو-ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و لە دەستی سەلامەت بن)

"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

***

{١١٣}

نە مەرگ ئەوەندە ترسناکە و نە ژیانیش ئەوەندە شیرینە، تا کەرامەتی خۆت لە دەست دەیت بۆیان.

"عەلی کوری ئەبوتالیب"

***

{١١٤}

زەردەخەنە کردن بەڕووی نەناسراوێکدا دەتوانێت ئەو ڕۆژەیان پرشنگدار بکات!

***

## (ژیان بەبێ هەڵە و کەم و کورتی نابێت!)

{١١٥}

لەشنە بای خەزانی باخچەی ڕۆژگار، دلگران مەبە
ژیرانە بیر بکەوە، گولی بێ دڕک لە کوێ بوونی هەبووە.
"حافظی شیرازی"

***

{١١٦}

هەرگیز پەشیمان مەبە لەو بڕیارانەی کە داوتە، هەر هەڵەیەک کە ئەنجامی ئەدەی وات لێدەکات ببیت بە کەسێکی زیرەکتر و بەهێزتر!

***

{١١٧}

هەڵەکان لەبیرکە،
وانەکانت لەبیر بێت!

***

## (ژیانی خۆت تایبەتە بە خۆت!)

{١١٨}

هیچ کەسێک لە تەواوی ئەو دونیایە بە ئەندازەی خودی خۆت نازانێت چ شتێک باشترینە بۆت!

***

{١١٩}

ژیان ڕێگایەکە تایبەتە بە خۆت،
دەشێ کەسێک بۆ ماوەیەک هاوەڵی ئەم ڕێگایەت بێت، بەڵام دوا جار دەبێ ئەو ڕێگایە بە تەنیا هەر خۆت بیبڕیت.
"مەولانای ڕۆمی"

***

{١٢٠}

تاکە شتێک کە گرنگە لە ژیاندا بۆچوونی خۆتە دەربارەی خودی خۆت،
ڕێزگرتنی خۆت لە خودی خۆت،
بەوجۆرە هیچ کەسێک ناتوانێت شکۆداریت بشکێنێت!

***

## (بەفیڕۆدانی کات، بەفیڕۆدانی ژیانە)

{١٢١}

خولەکەکان زۆر بەنرخترن لە پارە.
هەر بۆیە بە وریایەوە بەکاریان بهێنە..!

"تۆماس پ.مۆرفی"

***

{١٢٢}

ئەوە بزانە کە هەموو شتێک باش دەبێت، کاتێک تۆ کات و ئارامی زیاتر بە خۆت دەدەیت..!

***

{١٢٣}

کات یاریەکە کە بەجوانیەوە لەلایەن منداڵانەوە یاری پێدەکرێت!

{١٢٤}

سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا (الطلاق: ٧)

واتە: دڵنیاش بن کە خوا دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت، دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت.

***

{١٢٥}

گەر لە خاوەن بولبول بپرسی بۆچی بولبول لە قەفەز دەکەی؟

لە وەلامدا دەلێت بۆ ئەوەی بخوێنێت گوێم لە دەنگە خۆشەکەی بێت..

خوا گەورەش هەندێک جار مرۆڤ دەخاتە قەفەزی ناخۆشیەوە،بۆ ئەوەی گوێی لە دەنگی دووعاکانی بێت!

(مەولانەی ڕۆمی)

***

## (هەبوونی قەناعەت!)

{١٢٦}

چەند جوانە ئینسان بگاتە ئەو قەناعەتەی
بۆ هەموو شتێک بڵێ خێری پێوەیە تەنانەت ئەوەشی لە دەستی داوە.

"سەعیدی نورسی"

***

{١٢٧}

بەختەوەری لە هەبوونی ئەو شتانە دانیە کە دەتەوێت،
بەڵکو بەختەوەری لە ویستنی ئەوشتانەیە کە هەتە!
"ڕابی هایمان"

***

{١٢٨}

هەموو زریانەکان بۆ ئەوە نایانە کە ژیانت وێران و پارچە پارچە بکەن،
بەڵکو هەندێکیان بۆ ئەوەیە کە ڕێگاکەت بۆ پاک بکەنەوە!

***

## (لێبووردەییت گەورەییت دەسەلمێنێت!)

{١٢٩}

بەخشـــینی چاکە نرخت دیاری دەکات،
خۆنەویستـــی بەرزیت دەردەخـــات،
لێبووردەییت گەورەییەکانت دەسەلمێنێ.
"مامۆستا شەماڵ موفتی"

***

{١٣٠}

ئاگاداری وشەکانت بە کاتێک کە تورەیت، تەنها دەکرێت لێخۆشبوون هەبێت بۆیان، بەڵام لەبیرکردن نا!

***

{١٣١}

ئەوە ئێمەین کە خەڵکی فێردەکەین چۆن مامەڵەمان لەگەڵ بکەن!

"دکتۆر فیل"

***

{١٣٢}

(هەر کەسێک باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات، هەر کەسێک باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە مێوانەکەی بگرێت، هەر کەسێک باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێت)

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

❋❋❋

{١٣٣}

نە هەموو قامیشێک شەکری هەیە،

نە هەموو هاوارێک، دەنگی هەیە.

نە هەموو

چاوێک نەزەری هەیە،

نە هەموو دەریایەک، گەوهەری هەیە.

ئەی دڵ،

لە نزیک کەسێک دانیشە، لە دڵ خەبەری هەیە

لە ژێر درەختێک دانیشە، کە گوڵی تەڕی هەیە.

(مەولانای ڕۆمی)

❋❋❋

# (لە هیواشبوون مەترسە!)

{١٣٤}

کۆسپەکان ناتوانن تۆ بوەستێنن،
کێشەکان ناتوانن تۆ بوەستێنن،
خەڵکی ناتوانن تۆ بوەستێنن،
تەنیا خۆت دەتوانی ئەوە بەرامبەر خۆت بکەیت!

***

{١٣٥}

لە هیواشبوون مەترسە، بەڵکو لە نەجوڵان بترسە!

***

{١٣٦}

تەمبەڵی هیچ شتێک نیە جگە لەو خووەی کە پشووبدەیت بەرلەوەی ماندووبیت!

"جولیس ڕێنارد"

***

## (دەستی بەرز باشترە!)

{١٣٧}

(دەستی بەرز باشترە لە دەستی نزم، دەستی بەرز ئەو دەستەیە کەوا-بۆخوا-دەبەخشێ، دەستی نزم ئەو دەستەیە کەوا سواڵ دەکات).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

{١٣٨}

هەمیشە نزا بکە بۆ هەبوونی دوو چاو بۆ بینینی باشترینی خەڵک، دڵێک کە خراپترین ببورێت، مێشکێک کە خراپە لەبیربکات، وە ڕۆحێک کە هەرگیز متمانە لەدەست نەدات بە خودای مەزن!

***

{١٣٩}

ئەگەرسەروەت و سامانت هەبوو لێی ببەخشە،
ئەگەرنەتبوو دڵ بەخشندە بە...

(مەولانای ڕومی)

***

## (ئەوانە بزانە...)

{١٤٠}

دڵخۆشبە بەوەی کەهەتە لەکاتێکدا خەریکی کار بۆ ئەو شتە دەکەیت کە دەتەوێت بەدەستی بهێنیت...!

"هێلێن کێڵەر"

***

{١٤١}

تیشک بخەرە سەر ئامانجەکەت.

سەیری هیچ ئاراستەیەکی تر مەکە جگە لە (بەرەو پێشەوە)...!

***

{١٤٢}

کاتێک ڕووبەڕووی هەڵبژاردن دەبیتەوە، لە نێوان کارێکی ڕاست و کارێکی ئاسان.

ئەوا تۆ کارە ڕاستەکە هەڵبژێرە تەنانەت ئەگەر بێت و ئەستەمیش بێت!

***

{١٤٣}

فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ( ١٥) وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ (الفجر: ١٦ـ١٥)

واتە: جا کاتێک ئادەمیزاد لەلایەن پەروەردگاریەوە تاقی دەکرێتەوە، ڕێزی لێ دەنێت و نازو نیعمەتی بەسەردا دەڕێژێت، دەڵێت: وا دیارە پەروەردگارم خۆشی دەوێم ڕێزم هەیە لای،

بەڵام کاتێک تاقی دەکاتەوە و ڕزق و ڕۆزی کەمی پێدەبەخشێت و لێی دەگرێتەوە دەڵێت: وا دیارە پەروەردگارم منی خۆش ناوێت و ڕقی لێمە و ڕیسوای کردووم.

# (هەرگیز کۆڵ مەدە!)

{١٤٤}

هەرگیز کۆڵمەدە و بێ هیوا مەبە.
ڕۆژێک دێت سەیری دواوە دەکەیت و دڵخۆش دەبیت
بەوەی کە کۆڵت نەدا...!

***

{١٤٥}

ئەگەر خودا،ئارەزوویەکی خستە دڵتەوە،
ئەوە بزانە کە توانای بە دەستهێنانی لە تۆدا دیوە
بۆیە بێ هیوا مەبە لە بەدەست هێنانی»

***

{١٤٦}

کەشتی نوقم نابێت بەهۆی ئەو ئاوەی کە لە دەوریەتی،
نوقم دەبێت بەهۆی ئەو ئاوەی کە دەچێتە ناوی،
مەهێڵە ئەوەی کە لە دەورت ڕوودەدەن بچێتە ناختەوە و بترۆخێنێت.

"مەولانای ڕۆمی"

***

## (گرنگە بزانی کە چیت دەوێت!)

{١٤٧}

ئیشی چـرا ڕێگا ڕۆشنکردنـەوەیە،
بـەڵام گـەر نـەزانی بۆ کوێ دەڕۆیت،
ڕۆشـنـایی چـرا چ سـودێکی هـەیە!

"مەولانای ڕۆمی"

***

{١٤٨}

درەختەکان پێویستیان بە مەشقکردن نییە بۆ ئەوەی کە چۆن گەشە بکەن. هەنگەکان پێویستان بە مەشقکردن نییە بۆ ئەوەی کە چۆن هەنگوین بەرهەم بهێنن.
هەر بەوشێوەیە تۆش متمانەت بەخۆت هەبێت بەوەی کە ئەو کارەی کە دەتەوێت چۆن ئەنجامی بدەیت...!

***

{١٤٩}

پێویست ناکات تۆ ببیت بە کەسێکی نموونەیی، هەر ئەوەندە بەسەکە باشترین هەوڵی خۆت دەدەیت!

***

{١٥٠}

مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ. (الحديد:ـ٢٢ـ٢٣)

واتە: هیچ زیان و بەڵایەک ڕووی نەداوە نە لەزەوی و نە لەخودی خۆتاندا ئیللا لە (لوح المحفوض) دا نوسراوە، پێش ئەوەی بەدی بهێنین بێگومان ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە. تا خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لە دەستتان چووە وە دڵخۆش و غەڕا نەبن بەوەی کە پێ ی داوون وە خوا هیچ خۆ بەزل زانێکی شانازی کەری خۆش ناوێت.

***

## (تەنیا ڕۆژێکی خراپە نەک هەموو ژیانت!)

{١٥١}

ئەگەر تۆ دەتەوێت شتێک بەدەست بهێنیت لە ژیانتدا،
هەر ئێستا دەستبکە بە کارکردن بۆ بەدەستهێنانی. چاوەڕێ هیچ شتێک مەکە،
بزانە کە کاتژمێرەکەت بەردەوام چرکە چرکە دەکات!

***

{١٥٢}

ڕێگە مەدە ڕۆژە خراپەکان، واتلێبکەن کە پێتوابێت ژیانت خراپە، ئەوە تەنیا ڕۆژێکی کە خراپە نەک هەموو ژیانت ....!

***

{١٥٣}

گەر گوڵێکیان لە ناختدا کوشت،
خۆ باخچەکەت هێشتا زیندووە..

"مەولانای ڕۆمی"

***

## (لەکاتی توڕەییدا دانبەخۆتدابگرە!)

{١٥٤}

(کەسی ئازاو بەهێز ئەوە نییە کە لەکاتی شەڕ و زۆرانبازی دا ئازا بێت، بەڵکوو ئازا ئەو کەسەیە کە لەکاتی توڕەبووندا دان بەخۆی دابگرێت و سنوور نەبەزێنێت).
"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

{١٥٥}

ڕێگە مەدە خەڵکی تۆ بخەنە ناو زریانەکانیان،
تۆ ئەوان بخە ناو ئاشتی و ئارامی خۆتەوە... !

***

{١٥٦}

توڕەیی هیچ شتێک چارەسەر ناکات،
هیچی لێبەرهەم نایەت،
بەڵام دەتوانێت هەموو شتێک لەناوببات و وێرانی بکات...!

***

## (خۆتت خۆشبوێت و شانازی بەخۆتەوە بکە!)

{١٥٦}

گەر تۆ مانگت دەوێت،
بە شەو خۆت مەشارەوە.
گەر تۆ تۆ گوڵێکت دەوێت،
لە دڕکەکانی ڕامەکە!
گەر تۆ خۆشەویستیت دەوێت،
خۆت لە خۆت مەشارەوە....!

"مەولانای ڕۆمی"

***

{١٥٧}

نەرم و نیان بە.
ڕێگە مەدە جیهان تۆ بکات بە کەسێکی تووند.
ڕێگە مەدە ئازارەکان وا لە تۆ بکەن ببیت بەکەسێکی کینە لە دڵ. ڕێگە مەدە سەختیەکان شیرینی تۆ بدزن.
شانازی بە خۆتەوە بکە تەنانەت ئەگەر پێتوابوو تەواوی جیهان ناڕازین لێت!

"ئیان تۆماس"

***

## (بەردەوامبە!)

{١٥٨}

«کاتێک کەسێک
بە ئەندازەی تۆ نییە،
دەستکاری ئەندازەی خۆتی بۆ مەکە.»

«حسێن پەناهی"

***

{١٥٩}

پێویستە ئەوە بزانیت کە زۆرێک لە کەسانی دەورووبەرت باشنین بۆ تۆ، گرینگ نیە تۆ چەندە ئەوانیشت خۆشبوویێت...

***

{١٦٠}

بەردەوامبە!
چونکە کەسانێک هەن کە سەیردەکەن و چاوەڕێن شکست و کەوتنی تۆ ببینن.
تۆ ئەو هەلەیان پێمەدە..!

***

## (هەستەکان میوانێکن!)

{١٦١}

هەستەکان تەنها میوانێکن،
ڕێگە بدە بێن و بڕۆن...

***

{١٦٢}

ڕق لەناو زۆرێک لە خەڵکیدا بوونی هەیە، بەڵام ژیر ئەوەیە دڵی دەکاتە گۆڕستانی ئەو ڕقە، نەک پەروەردەی بکات و قەڵەوی بکات!

***

{١٦٣}

بگری، هاوار بکە و بقیژێنە ئەگەر پێویستی کرد،
بەڵام لە خۆت نائومێدمەبە و دەستبەرداری خۆت مەبە.
باشترینەکان هێشتا ماوە بێن...!

***

{١٦٤}

وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ( ٨) فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ (٩) سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ (١٠) (الأعلى: ١٠ــ٩ــ٨)

واتـە: جا دڵنیابە ئێمە یارمەتیت دەدەیـن بۆ ئەنجامدانی هەموو چاکەیەک، هەموو کارێکی لەبارت بۆ ئاسان دەکەین. کەواتە تۆ ئیتر لەسەر یادخستنەوە و یاداوەری ئەو کەسانە بـەردەوام بە کە سوودیان وەرگرتووە و ئامادەن زیاتر تێبگەن. بێگومان ئەوی لە خوا بترسێ پەندی لێ وەردەگرێت.

***

## (لەهەر کوێبیت لەگەڵتە!)

{١٦٥}

ئەو کاتەی هەموو دەرگاکان دادەخرێن،
چراکان هەموو دەکوژێنەوە،
وەلێ دەرگای میهری خودایی هەرگیز داناخرێت،
چرای هیوای خودایی هەرگیز خامۆش نابێت.

***

{١٦٦}

ئەگەر شتێک بەناوی مەحاڵ بوونی هەبوایە،
ئەوا خودا داوای صەبری لێ نەدەکردین...!

***

{١٦٧}

ئەوەندە دوعا بکە ئەوەندە بیکە،
تـا خودا لە ئاخیرا بفەرموێت:
« فَٱسۡـتَجَـبۡنَــا لَهُۥ»

***

## خۆشەویستی و میهرەبانی هەرگیز بەفیڕۆناچێت!

{١٦٨}

هیچ هەستێک مەزنتر نیە لە هەستی خۆشەویستی، هیچ ئازارێک بەهێزتر نیە لە ئازاری لەدەستدانی ئەو خۆشەویستیە...!

***

{١٦٩}

خۆشەویستی و میهرەبانی هەرگیز بەفیڕۆنادرێن.
هەمیشە جیاوازی دروست دەکەن.
ئەو کەسە پیرۆز و شاد دەکەن کە پێیدەدرێت،
تۆش پیرۆز دەبیت،
بەڵێ تۆ کە بەخشەرەکەی!

"باربارە دێ ئەنگێلس"

***

## (کارەکانی خودا پڕ حیکمەتن...)

{١٧٠}

( خوا بیەوێت خێر توشی کەسێک بکات،
توشی ناخۆشی و ئازاری دەکات)
"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

***

{١٧١}

کاتێک ژیان دەتهێنێتە سەر چۆک،
تۆ باشترین دەرفەتت هەیە بۆ سوجدە بردن!

«مەولانا»

***

{١٧٢}

بەدوو دڵییەوە مامەڵە لەگەڵ خودا دا مەکە، بەیەقینەوە مامەڵەی لەگەڵ بکە بۆ ئەوەی بە پەرجو مامەڵەت لەگەڵ بکات.

***

## (ئازایەتی مانای چییە؟)

{١٧٤}

زۆرێک لە خەڵکی دەترسن لە وتنی ئەوەی کە دەیانەوێت بیڵێن، هەر لەبەر ئەو هۆیە ئەو شتانە بەدەست ناهێنن کە دەیانەوێت...!

"مادۆنا"

***

{١٧٥}

ئازایەتی مانای ئەوە نییە کە نەترسیت، بەڵکو ئازایەتی ئەوەیە ڕێگە نەدەی ترس بتوەستێنێت..!

***

{١٧٦}

لەبیری نەکەیت بگەڕێیتەوە لای خۆت کاتێک هەموو جیهان دژی تۆیە، خۆت ببە بە کاپتنی تیمەکەت..!

***

## بەئاسانی بەدەست نایەت!

{١٧٧}

ئەوەی بە ئاسانی بەدەست دێت تا کۆتایی نامێنێتەوە، ئەوەشی کە تا کۆتای دەمێنێتەوە بە ئاسانی بەدەست نایەت...!

"یۆگی بهجان"

❊❊❊

{١٧٨}

گۆڕانکاری و کۆسپەکان بەشێکن لە ژیان، وامان لێدەکەن بەهێزتر بین و کەسایەتیمان بونیادبنێین.
ئەگەر ژیان ئاسان بوایە، ئەوا زۆر بێزارکەر دەبوو و ئێمەش هەرگیز گەشەمان نەدەکرد و پێنەدەگەیشتین!

❊❊❊

{١٧٩}

بیرت نە چێت کە مرۆ ڤایەتی، هەموو پێشکەوتنی خۆی قــەرزدارە بــە کۆمەڵێکی زۆر کــەم لــە مـرۆڤـەکـان، نەک زۆرینەی خەڵک!

❊❊❊

{١٨٠}

يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ (٦) فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ( ٧) فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا (٨) (الانشقاق:٦– ٨)

واتە: ئەی ئینسان بەڕاستی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەکەیت، زۆر ڕەنـج و زەحمەت دەکێشیت، سەرئەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای پـەروەردگـارت، ئینجا ئـەو کەسەی کە نامەیکردەوەی درایـە دەستی ڕاستی، ئـەوە لەمەودا لێپرسینەوەیەکی زۆر ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت.

❋❋❋

## (نهێنی بەختەوەری!)

{١٨١}

یەکەم نهێنی بەختەوەری
(کەوتنە خۆشەویستیە لەگەڵ خودی خۆتدا).

"ڕۆبێرت مۆرلی"

***

{١٨٢}

ئەگەر ڕۆژێک،
موحیبەتـ ـمان کرد بەبێ منەت،
چێژمان برد بەبێ گونـــاهـ
بەخـــــ شیمان بەبێ مەرج،
ئەو ڕۆژە بەڕاستی ژیانمان کردووە!

" فروغ فروغزاد"

***

{١٨٣}

دەتەوێت دڵخۆش بیت؟!
بوەستە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ببیت بە کەسێکی نموونەی!!
"برێن براون"

***

## (لەیادتبێت!)

{١٨٤}

ئەگەر تۆ دەتەوێت شتێک بەدەست بهێنیت کە هەرگیز نەتبووە پێشتر، ئەوا پێویستە خۆت ئامادەبکەی بۆ کارێک کە هەرگیز پێشتر ئەنجامت نەداوە!

"تۆماس جێفەرسۆن"

***

{١٨٥}

ئاوێنەکان تەنیا شووشەیەکن

(تۆش زۆر لەوە زیاتریت)

***

{١٨٦}

هەموو کۆتاییەک سەرەتایەکە بۆ شتێکی نوێ، بەڵام ئێمە لەو کاتەدا درکی پێناکەین!

"میچ ئەلبوم"

***

{١٨٧}

(هەر بەندەیەک عەیب و ناتەواوی بەندەیەک دابپۆشێ لە دونیا، ئەوا خوای گەورە لە قیامەت دا عەیب و ناتەواوی ئەو بەندەیە دادەپۆشێت).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

●●●

{١٨٨}

لـووتـکـەی مـرۆڤ بـوون ئـەوەیـە،
هــەرگـیـز لــە دونـیـادا
حـەز بـەکـەوتـنـی مـرۆڤـەکـان نـەکـەیت.

●●●

## (ئەگەر قسەکردن زیویێت بێدەنگی ئاڵتونە!)

{١٨٩}

قسە وەک دەرمان وایە،
ئەگەر کەم بلێیت بەسوودە،
ئەگەر زۆریش بلێیت کوشندەیە!

«ئیمامی عومەر»

***

{١٩٠}

ژیر ئەگەر بێدەنگ بێت، بیردەکاتەوە،
ئەگەر قسە بکات، یادی خوا دەکات،
ئەگەر بڕوانێت، پەند وەردەگرێت.

«شێخ محمد موتولي الشعراوي»

***

{١٩١}

هەمیشە قسەیەک بکە کە بەهاکەی لە بێدەنگی زیاتربێت...!

***

{١٩٢}

لە پێناو بەدەستهێنانی بەختەوەری مـەزن، پێویستە بە ئازاری مەزندا گوزەربکەین، ئەگەر وانەبێت چۆن بزانین دڵخۆشی چۆنە و چییە؟!!

"لیزلی کارۆن"

***

{١٩٣}

ئـەگـەر ئـەو ڕێـگـای گـرتـوتـەبـەر خـۆشـی و ئـاسـوودەی پێنەبەخشیت، باشتر وایە بگەڕێیتەوە و ئەو ڕێگەیە بدۆزەوە کە ئاسودەیت پێدەبەخشێت...

***

{١٩٤}

خەڵکی دوو جـۆرن، جۆرێکیان دەبینێت باشیت خۆشی دەوێت، جۆرێکیش دەبینێت باشیت دەتخوات!

***

{١٩٥}

سوربە لەسەر بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە سوودت پێ دەگەیەنێت.

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

{١٩٦}

ئەگەر خودا ویستی خێری هەبوو بۆ بەندەکەی ئەوا کاتەکانی بەرەکەتدار دەکات بۆی.

"ابن_القيم"

***

## (ڕەنگە گۆڕان مەترسیداربێت!)

{١٩٧}

هەوڵ بدە وانە فێربیت لە ڕابردووت،
بەڵام ڕێگە مەدە کۆنترۆڵت بکات!

"مێل ڕۆبینس"

***

{١٩٨}

باوەڕت هەبێت کە دەکرێت ببێت!
کاتێک باوەڕت هەیە بە ئەنجامدانی شتەکان، "باوەڕێکی ڕاستەقینە" مێشکت بە دڵنیاییەوە ڕێگەی ئەنجامدانی ئەو کارە دەدۆزێتەوە.
باوەڕبوون بە چارەسەر ڕێخۆشکەرە بۆ چارەسەربوون...!
"دەیڤد ج.سکوارتز"

***

{١٩٩}

گۆڕان لەوانەیە مەترسیداربێت،بەڵام دەزانی مەترسیدارتر چیە؟!ڕێگە بدەی ترس بتوەستێنێت لە گەشەکردن و بەرەوپێش چوون..!

"ماندی هالی"

***

## (بڕیاردەرتۆی!)

{٢٠٠}

کاتێک دوچاری ئێش و ئازار دەبیت،
سەرپشکیت کە بیر لەسارێژبوون بکەیتەوە،
یاخود خۆت بۆ ئازار و دەردی زیاتر ئامادە بکەیت!

***

{٢٠١}

تۆ هەمیشە لەگەڵ خودی خۆتدا تەنهایت،
بەڵام تەنها ئەوکاتە هەست بەبێ کەسی و تەنهای دەکەیت
کە خۆتت خۆشنەوێت!

***

{٢٠٢}

هەڵخلیسکان لە کوێرە ڕێیەکانی ژیاندا،
لەپلە و پایەی مرۆڤ کەم ناکاتەوە،
بەڵکو تەنها بەو مانایە دێت کە بوارێک هاتۆتە کایەوە بۆ
فێربوون!

***

## (دیاریە مەزنەکانی خودا!)

{٢٠٣}

کاتـێک قسە لەگەڵ خوا دەکەی،
هیچ هەناسەیەکت بەخەسار ناچێت،
کاتێک چاوەڕێی خوا دەبیت،
هیچ کاتێکت بەفیرۆ ناچێت،
کاتێک متمانە بەخوا دەکەی،
هەرگـیز ڕەنگـی دۆڕان نابـینیت..!

***

{٢٠٤}

هەندێک کات دیارییە مەزنەکانی خودا بۆ ئێمە لە (وەڵام نەدانەوەی نزاکانمانە)...

***

## (نامەیەک بۆ خۆت بنوسە!)

{٢٠٥}

کاتێک دەڵێی "خۆشم دەوێی"بە مانای ئەوەدێت "من ئاشتی و بەختەوەری ڕاستەقینەت پێدەبەخشم"
دەتوانی سەرەتا ئەوانە بە خۆت ببەخشی؟؟

***

{٢٠٦}

ئەگەر تۆ خودی خۆتت خۆشنەوێت زۆر ئەستەمە بتوانیت خۆشەویستی ببەخشی بە کەسانی تر، ناکرێت شتێک ببەخشی کە خۆت نیتە...!
"جۆیس مێیەر"

***

{٢٠٧}

نامەیەکی خۆشەویستی بۆ خۆت بنوسە و کاتێک تەرخان بکە بۆخوێندنەوەی بۆ خودی خۆت.
بەوجۆرە هەستی سۆزداری و خۆشەویستی خۆتت بۆ دەردەکەوێت!!

***

# (یارمەتی دەربە!)

{٢٠٨}

بەجۆرێک ڕەفتار لەگەڵ خەڵک بکە،
وەک ئەوەی "یارمەتیدان"
بەشێک بێت لە بەرپرسیارەتی تۆ!

***

{٢٠٩}

تەنیا ئەوکاتەی کە لەگەڵ خودی خۆتدا میهرەبانبیت، دەتوانیت بۆ جیهانیش میهرەبان بیت!

***

{٢١٠}

ئەو زمانەی کە بەکاری دەهێنیت بۆ قسەکردن دەربارەی خۆت، بە ئەندازەی ئەو خواردنە گرنگە کە بە جەستەتی دەبەخشیت..!

***

## (دوای دڵت بکەوە!)

{٢١١}

دڵت ئازادە،

تۆش با ئەو ئازادییەت هەبێت کە دوای بکەویت!

***

{٢١٢}

هەزاران ڕێگە لە وتنی "خۆشم دەوێی" لە دڵەوە دێن.

تۆ ڕێگە بدە بێن و بوترێن!

***

{٢١٣}

هەر چەند تۆ زیاتر خۆتت خۆش بووێت،

ژیان لەبەرامبەردا زیاترت پێدەبەخشێت!

"ناڤاڵ ڕاڤیکانت"

***

## (بەخشین یەکسانە بەوەرگرتن!)

{٢١٤}

لە کۆتاییدا ئەو خۆشەویستیەی کە وەریدەگریت، یەکسانە بەو خۆشەویستییەی کە دەی بەخشیت!

***

{٢١٥}

کات زۆر لە پارە بەنرختر و بەهادارترە، لەبەرئەوەی دەتوانی پارەی زیاتر بەدەست بهێنیت و پەیدای بکەیت بەڵام هەرگیز ناتوانی کاتی زیاتر بەدەست بهێنیت..!

"جیم ڕۆن"

***

(٢١٦)

بە ئەندازەی ئەو متمانەیەی کە هەتە دەتوانیت پێبکەنیت!!!

"مارتین لوسەر کینگ"

***

## (گۆڕینی خراپە.)

{٢١٧}

(هەر کەسێک لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بە دەست بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت، ئەوە لاوازترینی ئیمانە)).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

{٢١٨}

ئەگەر بیرکردنەوەکانت بگۆڕیت،
دەتوانی جیهانت بگۆڕیت!

***

# (سوپاسیان بکە!)

{٢٢٢}

سوپاس!

بۆ ئەوکەسانەی کە نرخ و بەهای ئێمە لە خۆمان باشتر و زیاتر دەزانن!

***

{٢٢٣}

ئەو کەسەی کە ڕقی لێتە هیچ نییە جگە لە پاڵنەر و هەوادارێک، تەنها ئەوەیە کە نازانن چۆن خۆیان بە ئەرێنی پیشان بدەن..!

"بار ڕیفەیڵ"

***

{٢٢٤}

پێم بڵێ کە ناتوانیت،

ئینجا سەیرم بکە چۆن دووئەوەندە زیاتر هەوڵ ئەدەم بۆئەوەی بۆتی بسەلمێنم کە تۆ هەڵەیت...!

"هێضەر میت"

***

## (گرنگی پەیوەندییەکان)

{٢٢٥}

پەیوەندی بەهێز و تۆکمە بەندە بە دوو خاڵەوە:
یەکەم: بەنرخدانانی چوونیەکەکان.
دووەم: ڕێزگرتنی جیاوازیەکان.

***

{٢٢٦}

خراپترین تەنیایی ئەوەیە کە تۆ لەگەڵ خودی خۆتدا ئاسوودە نەبیت..!
"مارک تووین"

***

{٢٢٧}

ئاساییە ئەگەر تەنیا بیت و خەمباربیت،
بەڵام لە پێناو پشوودان و چاککردنەوەی خۆت و ڕاستەقینەبوونی خۆت...!
"سوزان جەین"

***

## (بەختەوەری لەدەستەکانی خۆتدایە!)

{٢٢٨}

هەبوونی زیاتر و زیاتر کێشەکان چارەسەر ناکات،
بەختەوەری لە بوونی سامانی زۆردا نیە.
تەنانەت بەختەوەری لە هەبوونی پەیوەندیەکانیش نیە،
بەڵکو وەڵامەکە ئەوەیە کە بەختەوەری "لە ناو ناخی ئێمە "دایە. ئەگەر ئێمە نەمانتوانی ئاشتی و بەختەوەری لە ناخی خۆماندا بدۆزینەوە، دڵنیابە هەرگیز لەدەرەوەی ناخی خۆماندا نایدۆزینەوە...!

***

{٢٢٩}

کات تێدەپەڕێت ئەگەر تۆ بتەوێت یاخود نەتەوێت،
هەر لەبەرئەوە هەوڵبدە لەوشتانەدا بەکاری بهێنیت کە خۆشی و ئاسودەیت پێدەبەخشێت...!

***

## (تۆ زۆر بەنرخیت!)

{٢٣٠}

کاتێک پرسیارت لێدەکرێت دەربارەی ئەو شتانەی کە خۆشت دەوێن،
دڵنیابەوە لەوەی کە یەکەم شت ناوی خۆت بڵێیت...!

***

{٢٣١}

کاتێک تۆ نرخی خۆت دەزانی،
ئەوە تۆنیت کە کەسەکان لەدەست دەدەیت،
بەڵکو ئەوانن کە تۆ لەدەست دەدەن...!

***

{٢٣٢}

ئێستا ئەنجامی بدە.
دواتر سوپاسی خۆت بکە!

***

{٢٣٣}

وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (الحديد: ٤)

واته: جا لەهەر شوێنێک دابن ئەو زاتە لەگەڵتاندایە و پێتان دەزانێت، دڵنیابن کەخوا بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە.

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ (ق: ١٦)

واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان دروست کردووەو دەزانین چی بەدڵ و دەروونیدا دێت، ئێمە لەشاڕەگی دڵی لێی نزیکترین.

***

## (تورەمەبە!)

{٢٣٤}

ساتێک ئارامگری لە تورەییدا
هەزار ساتی پەشیمانیت لێ دوور دەخاتەوە.
«عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب»

***

{٢٣٥}

تورەیی هەستێکە کە وادەکات دەمت خێراتر لە مێشکت کاربکات...!

***

# (باکەس درەوشانەوەت لەناونەبات!)

{٢٣٦}

ئەگەر تۆ دەتەوێت کەسێک یا شتێک لەبیربکەیت، نەکەی هەرگیز ڕق هەڵگری بەرامبەری. چونکە هەرکەسێک یا شتێک کە تۆ ڕقت لێیەتی ئەوا شوێنێک لەناو دڵتا هەڵدەکۆڵێت؛ ئەگەر تۆ بتەوێت واز لە شتێک بێنیت و لەبیری بکەیت، نابێت ڕقتلێیبێت.

***

{٢٣٧}

ڕێگە مەدە هیچ کەسێک درەوشانەوەت لەناو ببات....

***

{٢٣٨}

مرۆڤەکان دەگۆڕێن و لەبیری دەکەن،
ئەوە بەیەکتری بڵێن...!

"لیلیان هێڵمان"

***

{٢٣٩}

تۆ پێویستیت بە بارانە.
تۆ پێویستیت بە خۆرە.
هیوا مە خوازە بۆ ئەوەیان لە کاتێکدا ئەوەیتریانت هەیە...!

***

{٢٤٠}

هەندێ لەخەڵکی هەست بە دڵۆپەکانی باران دەکەن،
هەندێکیشیان تەنها تەڕدەبن...!

***

{٢٤١}

هەرگیز ژیان زۆر بەجدی وەرمەگرە،
چونکە دڵنیابە بەزیندووی لێی دەرناچیت...!
"ئەلبێرت هاببارد"

***

{٢٤٢}

وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ (الطور: ٤٨)

واتە: ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت، ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت هەرکاتێ (لەخەو) هەستایت تەسبیحات بکە بە ستایشی پەروەردگارت.

***

## (نزاکلیلی هەموو قوفڵێک!)

{٢٤٣}

کاتێک دڵت دەشکێت تۆ دەستبکە بە چاندنی تۆو لەناو درزەکانی دڵت، دواتر نزای بارینی بارانبکە..!

"ئاندیا گیبسۆن"

***

{٢٤٤}

وەرن با نزاکانمان بۆ پەناگا نەبێت لە مەترسی و کێشەکان، بەڵکو بۆ ئازایەتی ڕووبەڕوونەوەیان بێت..!

"ڕابیندراناز تاگۆری"

***

{٢٤٥}

ئێمە ناتوانین هەمیشە ئەو شتانە بگۆڕین کە لە ژیانماندا ڕوودەدات، بەڵام ئێمە دەتوانین چۆنیەتی کاردانەوە و ڕەفتارمان و چۆنیەتی ژیان کردنمان لە داهاتوودا بگۆڕین، ژیان کردن بە بێ پەشیمانی ژیانکردنێکی سەرکەوتوانەیە...!

***

## (سوپاس بۆ خودا...)

{٢٤٦}

خودا" با" دەنێرێت.
بەڵام پێویستە ئێمە چارۆکەکەمان بەرزکەینەوە!

***

{٢٤٧}

خودا (٨٦،٤٠٠ )چرکەی وەکو دیاری ئەمڕۆ بەخشیوە بەتۆ، ئایە تۆ یەکێک لەو چرکانەت بەکارهێناوە بۆ ووتنی «سوپاس بۆ تۆ خودایە»؟

***

{٢٤٨}

متمانە بوون بە خودا مانای ئەوەنیە پێت وابێت خودا ئەوەت پێبدات کە دەتەوێت، بەڵکو متمانە بوون بە خودا ئەوەیە کە باوەڕت وابێت خودا ئەوەت پێدەبەخشێت کە باشترینە بۆت.

***

## (خێزان هەموو شتێکە!)

{٢٤٩}

خێزان تەنها شتێکی گرنگ نیە،
بەڵکو هەموو شتێکە...!
"میچێل ج.فۆکس"

***

{٢٥٠}

خێزانەکەت خۆشبووێت.
کاتیان لەگەڵدا بەسەربەرە،
میهرەبان بەو خزمەتی یەکتری بکەن.
هیچ ژوورێک بۆ پەشیمانی دروست مەکە، سبەی بۆ کەسمان بەڵێندراو نیە کە دێت وە ئەمڕۆش زۆر کورتە...!

***

{٢٥١}

بەوکەسانەی کە خۆشتدەوێن پێیان بڵێ کە هەستت چۆنە بەرامبەریان، دڵنیابە ئەوە ژیانیان دەگۆڕێت...!

***

## لە دوژمنەکانت خۆشبە!

{٢٥٢}

هیوا بخوازە دوژمنەکانت تەمەنێکی درێژ بژین،
بۆ ئەوەی سەرکەوتنی تۆ ببینن..!

"نیشان پانوار"

***

{٢٥٣}

هەمیشە لە دوژمنەکانت خۆشبە،
هیچ شتێک ئەوەندەی ئەوە بێزاریان ناکات..!

***

{٢٥٤}

لەوانەیە کەسانێک بەتۆ پێبکەنن،
بەڵام تۆ دڵنیابەوە لەوەی کە پێکەنینی کۆتایی تۆیت...!

***

## (هاوڕێیەتی ڕاستەقینە گەنجینەیە!)

{٢٥٥}

ئەوەی هاوڕێیەکی بەوەفا بدۆزێتەوە،
گەنجینەیەکی دۆزیوەتەوە...!

***

{٢٥٦}

خراپترین دڵشکاندنەکان زۆرکات لەلایەن خۆشەویستەوە نییە، بەڵکو زۆر جار لەلایەن هاوڕێکانەوەیە...!

***

{٢٥٧}

لەکۆتاییدا،
ئێمە قسەی دوژمنەکانمان لەبیر نامێنێت، بەڵام ئەوەی لەبیرمان دەمێنێت بێ دەنگی هاوڕێکانمانە...!

***

# (لە دونیا وەک ڕێبوارێک بژی.)

{٢٥٨}

(وا لە دونیا بژی وەک غەریبێک یان ڕێبوارێک).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

{٢٥٩}

گەلیک سەیرە....

خۆ تۆ بۆ دونیا دروست نەکراوی،

تا تەنها سەرقاڵی دونیا بیت..!

" سعیدی نورسی"

***

{٢٦٠}

هەموو شتێک لە ژیاندا بۆ هۆکارێک ڕوودەدات.
ئاساییە ئەگەر تۆ هێشتا نەزانی هۆکارەکە چییە...!

***

{٢٦١}

بزانە کە زۆر ئاساییە ئەگەر بگریت،
ئاساییە ئەگەر تورەبیت،
تەنانەت هەستە خراپەکانیش بە هۆکار بوونیان هەیە،
هەبوونی ئەو هەستانە واناکات تۆ بکات بە کەسێکی خراپ...!

***

{٢٦٢}

هەموو شتێک بە هۆکارێک ڕوودەدات،
بەڵام هەندێ جار تێگەیشتن لەم هۆکارانە ئەستەمە!

***

# (کاری ئیماندار زۆر جێگای سەرسوڕمانە)

{٢٦٢}

(کاری ئیماندار زۆر سەیرە، هەموو کارەکانی هەر بە چاکە بۆ دەنووسرێ، ئەوە بۆ کەس نییە تەنها بۆ ئیماندارە، ئەگەر توشی خۆشی یەک بێت ئەوا سوپاسی خوا دەکات، سەرەنجام دەبێ بە خێر بۆی، ئەگەر تووشی ناخۆشی یەک بێت ئەوا ئارام دەگرێت، سەرەنجام دەبێت بە خێر بۆی).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

***

## (زۆر جار.....!)

{٢٦٤}

ئەگەر قوربانی نەدەیت لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە دەتەوێت، ئەوا ئەوشتەی کە دەتەوێت دەبێت بە قوربانی..!

***

{٢٦٥}

زۆربەی ئەوشتانەی کە ترسمان هەیە لە ئەنجامدانیان، زۆرجار ئەو شتانەن کە پێویستە بە دڵنیاییەوە ئەنجامی بدەین ...!

***

{٢٦٦}

وامەزانن ئەوانەی چاویان هەیە دەتوانن ببینن، هیچ شتێک لە دونیادا لە بینین زەحمەتتر نیە، دەکرێت مرۆڤ دوو چاوی گەش و ڕوونی هەبێت بەڵام هیچ نەبینێت...!
"بەختیار عەلی"

***

{٢٦٧}

وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ.

(البقرة: ١٥٥)

واتە: سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێک لە ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچوونی بەرو بوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن...

***

## (ئارامیت بدۆزەوە!)

{٢٦٨}

کاتێک کە تۆ ڕاستیت، پێویست ناکات توڕەبیت.
کاتێک هەڵەیت، هیچ ڕاست نیە ئەگەر توڕەبیت...!
"گاندی"

***

{٢٦٩}

ئاشتی و ئارامی.
بە مانای ئەوە نایەت کە تۆ لە شوێنێک بیت هیچ ژاوەژاو و کێشەو ئاستەنگی نەبێت، بەڵکو بەو مانایە دێت کە تۆ لەناو جەرگەی ئەوشتانە دابیت و هێشتا لەدڵەوە ئارامبیت...!

***

{٢٧٠}

ئاشتی و ئارامی ناخت ئەو کاتە بەدەست دێنیت کە بڕیاربدەی هیچ کەسێک ناتوانێت کۆنترۆڵت بکات جگە لە خۆت...!

***

## (ڕابردوو بەشێکە لە ژیان نەک تەواوی ژیان!)

{٢٧١}

شتێکی زۆر نامۆیە ئێمە زۆر بەتوندی پارچەکانی ڕابردوومان گرتووە، لەهەمانکاتدا چاوەڕوانی داهاتووین...!

"ئالّی کۆندی"

***

{٢٧٢}

سروشتی مرۆڤ بەم شێوەیە کە دەیەوێت بگەڕێتەوە دواوە و شتەکان چاک بکاتەوە، یان ئەوشتانە بگۆڕێت کە پەشیمانە بۆیان...!

"جۆن کای"

***

{٢٧٣}

پێویستی بە ڕەنج و هەوڵدانێکی زۆر هەیە،
بۆئەوەی خۆت لە یادگاریەکان ئازاد بکەیت..!

"پاولۆ کیولۆ"

***

{٢٧٤}

بوەستە لە پرسیاری:
بۆچی ئەوە ڕوودەدات؟
دەستبکە بە پرسیاری:
چۆن دەتوانم لەوەوە گەشە بەخۆم بدەم و وانەی لێوەرگرم؟
"کارین سەلمانشۆن"

***

{٢٧٥}

دوو جۆر لە خەڵکی بوونیان هەیە کە بە تۆ دەڵێن ناتوانیت جیاوازی دروست بکەیت لە جیهاندا:
ئەوانەی کە ترسیان هەیە لە هەوڵدان و تاقیکردنەوە،
ئەوانەی کە ترسیان هەیە لە سەرکەوتنی تۆ...!
"ڕای گۆفۆڕز"

***

{٢٧٦}

خەونەکانت بە زیندووی بهێڵەوە.
لەبیرتبێت هیچ شتێک مەحاڵ نیە لەلای ئەوکەسانەی کە هەمیشە باوەڕیان هەیە...!

***

## (ئەگەر پارەت نیە گەشت بکەی بە جیهاندا)

{٢٧٧}

ئەگەر پارەت نیە گەشت بکەی بەجیهاندا،
ئەوا لاپەڕەی هەر پەرتوکێک کۆلانی ولاتێکە.

گابرێل گارسیا مارکیز

***

{٢٧٨}

دۆستی ڕاست و بێ منەت کتێبە و بەس؛
مێژووت بۆ دەڵێت؛
چیرۆکی کۆن و تازەت بۆ دەگێڕێتەوە،
لێی بپرسە جوابت دەداتەوە و منەتت لەسەر ناکات..!

"مامۆستا هێمن"

***

{٢٧٩}

ژووری بێ کتێب وەکو جەستەی بێ گیان وایە...!

***

## (تۆ زۆر بەنرختریت لەوەی کە پێت وایە!)

{٢٨٠}

مەترسە لەوەی بە خۆت بڵێیت "خۆشم دەوێی".
لەبەردەم ئاوێنە بوەستە و سەیری خۆت بکە بە دەنگێکی بەرز بە خۆت بڵێ "خۆشم دەوێی" بڵێ من ڕێز لەو خۆڕاگریەت دەگرم کە لە ژیاندا تووشی هاتووی، خۆشم دەوێی بۆ ئەوەی کە دەتەوێت ببیت..!

"ئاڤیجیت داس"

***

{٢٨١}

تۆشایستەی زیاتر لە چاپتەرێکیت( بەش).
تۆ شایستەی کتێبێکیت کە ئەوان نەتوانن بوەستن لە خوێندنەوەی...!

***

## (ڕاستییەکی سەرنجڕاکێش!)

{٢٨٦}

هەمیشە ئەستەم دەردەکەوێت،
هەتاوەکو ئەنجام دەدرێت و کۆتایی پێدێت...!
"نیڵسۆن ماندێلا"

***

{٢٨٧}

چەندە بیرۆکەیەکی سەرنج ڕاکێش و نایابە کە زۆرێک لە باشترین ڕۆژەکانی ئێمە هێشتا ڕووی نەداوە...!

***

{٢٨٨}

درۆیەک دەتوانێت نیوەی زەوی بگەڕێت، لەکاتێکدا ڕاستی هێشتا خەریکی لەپێ کردنی پێڵاوە...!
"مارک توین"

***

## (ئەگەر تۆ نەبیت ئەی کێ؟)

{٢٨٣}

بوێربە بۆ ژیانکردنی ئەو ژیانەی خەونی پێوەدەبینی، بەرەو پێشەوە برۆ و خەونەکانت بکە بەڕاستی..!

***

{٢٨٤}

بڕوات بە خەونەکانت هەبێت،
ئەگەر خۆت باوەڕت نەبێت ئەی کێ؟

"جۆن بۆن جۆڤی"

***

{٢٨٥}

تۆ دەتوانی لەهەر کاتێکدابێت کۆتای کتێبەکەت بگۆڕی.
تەنها ئەوەت لەبیربێت کە تۆ نووسەری ژیانی خۆتی...!

***

## (دووربە لەکەسانی نەرێنی!)

{٢٨٩}

زۆر وریابە نەکەی خەونەکانت لەگەڵ کەسانی نەرێنی هاوبەشی بکەیت...!

***

{٢٩٠}

هەرچیەک بکەیت، بە باشە یاخود بە خراپە، خەڵکی هەمیشە شتێکی نەرێنیان هەیە بۆ وتن...!

***

{٢٩١}

لەبیرمان نەچێت؛

زەین موگناتیسە، ئیتر نەڵێیت بۆ لەهەرچی ترسام بەسەرم هات!

***

## (هیچ ڕۆژێک بەڕێمەکە بەبێفێربوون!)

{٢٩٢}

هەموو ڕۆژێک بخوێنەوە،
بە هەمان ئەو ئەقڵەی کە پێی بەخەبەرهاتی مەخەوە...!
"شەمسی تەبریزی"

***

{٢٩٣}

باشترین مامۆستاکان ئەوانەن کە پیشانت دەدەن سەیری کوێ بکەیت، بەڵام پێت ناڵێن کە پێویستە چی ببینی...!
"ئەلێکساندرا ترێنفۆر"

***

{٢٩٤}

با فێربونەکانت تەنها بۆ زیادکردنی زانیاریەکانت نەبێت، هەوڵبدە کاریان پێبکەیت!
"جیم ڕۆن"

***

# (بەهەشت لەژێرپێی دایکانە...)

{٢٩٥}

تەنیا بۆنێک بە درێژایی تەمەن و تا مردن لە لووتی مرۆڤدا دەمێنێتەوە و هیچ کات گۆڕانی بەسەردا نایەت، بۆنی دایکە!!

***

{٢٩٦}

فیداکاری ڕاستەقینە تەنها دایکانن، کە بێ دوودڵی ئارەزوویانە تەواوی ئازارەکانی ڕۆڵەکانیان لە ئامێزبگرن..!
"تۆپاک"

***

{٢٩٧}

دایک ئەو کەسەیە کە هەموو کات خۆشەویستی بۆت هەیە، هەتا ئەو کاتەش کە فەرش لەسەر ئاگر ڕادەخەیت...!

***

## (کات تەرخانبکە بۆ خوێندنەوە!)

{٢٩٨}

خوێندنەوە کلیلێکە کە دەرگای زۆر شتی باش بەڕووی مرۆڤدا دەکاتەوە، خوێندنەوە شێوە دەدات بە خەونەکان، وا دەکات خەونەکان ببن بە ڕاستی...!

"ڕۆز بادەر"

***

{٢٩٩}

هەرگیز مەوەستەو وازمەهێنە لە زانین و فێربوون، چونکە ژیان هەرگیز ناوەستێت لە وانە و فێرکردن...!

***

{٣٠٠}

گرنگ نییە کە تۆ پێتوایە چەندە سەرقاڵیت، پێویستە کاتێک تەرخان بکەیت بۆ خوێندنەوە. ئەگەرنا خۆت بەدەستەوە بدە بۆ ئەوەی کە تۆ "نەزانیت"هەڵبژاردووە...!

***

## (هیچ شتێک بەبێ ناڕەحەتی بەدەست نایەت!)

{٣٠١}

لەش و لارێکی ڕێک، مێشکێکی ئارام،ماڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و ئاسوودەیی.
ئەوانە شتانێکن بە پارە ناکڕدرێن، بەڵکو پێویستە بە دەست بهێنرێن...!

"ناڤاڵ ڕاڤیکانت"

***

{٣٠٢}

هیچ ڕێگەیەکی ئاسان بۆ سەرکەوتن نیە...!

***

{٣٠٣}

کاتێک شکست دێنیت و دەکەویت، سەرنج بخەرە سەر چارەسەر نەک کێشەکە.
لەوانەیە ١٠٠ جار شکست بێنیت و نائومێدبیت، بەڵام هەمیشە ئەو وێنەیە بە ڕوونی لەمێشکدا بهێڵەوە کە دەتەوێت بە کوێ بگەیت!؟

***

## (بەزەردەخەنەت ژیان ئاسان بکە...)

{٣٠٤}

هەمیشە زەردەخەنە بکە،
ژیان ئاسان بکە بۆ کەسانی تر...!

***

{٣٠٥}

من دڵخۆشیم هەڵبژاردووە،
چونکە ئەوە باشترینە بۆ تەندروستیم...!

"ڤۆڵتایەر"

***

{٣٠٦}

زەردەخـەنـەکـردن دڵ دەکاتـەوە بـەڕووی بـەختـەوەری ڕاستەقینە...!

***

{٢٠٧}

وَأَنفِقُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ (البقرة: ١٩٥)

واتە: لە ڕێ و ڕێبازی خوادا بۆ ڕەزامەندی ئەو، ماڵ و سامانتان ببەخشن، بەدەستی خۆتان، خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن، هەمیشە خێرو چاکە ئەنجام بدەن و چاکەخواز بن و (ماڵ و سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونکە بەڕاستی خوا ئەو چاکە کارانەی خۆشدەوێت.

***

## (دەکرێت ئازار لەهەر ڕێگەیەکەوە بێت!)

{٢٠٨}

کاتێک ئازاری کەسێک نەدەیت، یا دڵی نەشکێنیت
بیربکەوە کاتێک مرد داوای لێبووردن لە کێ دەکەیت؟؟

***

{٢٠٩}

دەبێت بزانین کە دەکرێت ئازار لەهەر ڕێگەیەکەوە بێت، هەر لەبەر ئەوە با ئازاری کەس نەدەین...!

***



{٢١٠}

خراپترین جۆری ئازار خیانەتە، چونکە مانای ئەوەیە کەسێک ئامادەیە تۆ بخاتە ئازارەوە، تەنها لەبەرئەوەی خۆیان هەستێکی باشتریان هەبێت...!

***

## (تێرامان...)

{٣١١}

ژیان کردن بەبێ هیچ ئامانجێک، وەکو فڕین بە فڕۆکە وایە کە نەزانین لە کوێ بنیشینەوە. ئامانجی ژیان کردن ئەوەیە کە بزانین بۆ کوێ دەڕۆین، ئینجا بڕۆین...!

***

{٣١٢}

جوانی و سەرنج ڕاکێشانی گۆزەیەک، نابێ ئەوەمان لەبیر بباتەوە کەئاوی ناو گۆزەکە تینوویتی دەشکێنێ، نەک جوانی گۆزەکە..!

"مەولانای ڕۆمی"

***

{٣١٣}

سبەی،کاتێک تۆ پەپولەیەکی جوانیت،

زۆر بە ئەستەم ئەو ڕۆژانـەت بیردەکەوێتەوە کە تەنها کرمۆکەیەک بوویت...!

***

## (سزای خۆبەگەورەزانین.)

{٣١٤}

(ناچێتە بەهەشتەوە هەر کەسێک مسقاڵە زەڕەیەک خۆ بەگەورە زانینی لە دڵ دا هەبێت) ئینجا پیاوێک وتی: پیاو حەز دەکا جلەکەی جوان بێ و پێڵاوەکەی جوان بێت، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (بێگومان خودا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت، خۆبەگەورە زانین ئەوەیە کە حەق ڕەتبکەیەوە و وەری نەگریت و خەڵکی بە کەم بزانی).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)"

***

# هێز!

{٣١٥}

زۆرجار پێویستیت بە هێز نیە بۆ وازهێنان لە شتەکان،
بەڵکو هەموو ئەوەی پێویستە "تێگەیشتنە".

***

{٣١٦}

خەڵکی پێیان وایە وازهێنان لاوازیە.
بەڵام هەندێجار وازهێنان بەهێزترین شتە کە دەتوانیت ئەنجامی بدەیت...!

***

{٣١٧}

هەرگیز نازانیت کە چەندە بەهێزیت،
هەتاوەکو بەهێزبوون دەبێت بە تاکە بژاردەت...!
"بۆب مارلی"

***

## (فێری ئەوە بە!)

{٣١٨}

خۆت پاکبکەوە لەو کەسانەی کە بەجۆرێک مامەڵە دەکەن وەکو ئـەوەی کاتی تۆ هیچ گرنگ نەبێت، وەکو ئـەوەی هەستەکانی تۆ بێنرخ بێت، یاخود وەکو ئەوەی ڕۆحی تۆ جێگرەوە و هاوشێوەی هەبێت...!

***

{٣١٩}

پێویستە ئەوە فێربین لە ژیاندا کە دەکرێت گرنگبین لە ژیانی کەسێکدا، بەڵام هەموو کاتێک نا...!

***

{٣٢٠}

ئەو شتانەت خۆشبووێت کە هەتە، بەر لەوەی ژیان فێرت بکات کە ئەو شتانەت خۆشبووێت کە لە دەستت داوە...!

***

{٣٢١}

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ (الحجرات: ١١)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێک گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش بەگاڵتە بەیەک نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن... سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن، هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کەچەند ناشیرینە ناو و ناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەووە لەگوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانەهەر ستەمکارن.

***




**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون " ئاڤان بەهجەت " کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

---

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

## (ژیان زۆر لەوە کورتترە!)

{٣٢٢}

ژیان زۆر لەوە کورتترە کە بەیانیان بە پەشیمانیەوە لە خەو هەستیت. هەربۆیە ئەو کەسانەت خۆش بوویت کە باش ڕەفتارن لەگەڵت، لەوانەش خۆشببە کە وانین لەگەڵتدا...!

***

{٣٢٣}

هەموو پەیوەندیەکان یەک یاسایان هەیە.
هەرگیز ڕێگە مەدە ئەو کەسەی کە خۆشت ئەوێت هەست بەتەنیایی بکات، بەتایبەت ئەو کاتەی کە لەلای بوونت هەیە...!

***

{٣٢٤}

تۆوی بەختەوەری، هیوا، سەرکەوتن، خۆشەویستی بچێنە
دڵنیابە هەموو ئەوانە بەزیادەوە دێنەوە ڕێگات،
چونکە ئەوە یاسای سروشتە...!
"ستیڤ مارابۆڵ"

***

## (خاوەنداریەتی بڕیارەکانت بکە!)

{٣٢٥}

گەر میوانداری بەفرت کرد،
مەهێڵە گەرمای بێت،
نەباداماڵەکەت ئاو بیبات..!
"شێرکۆ بێکەس"

***

{٣٢٦}

ئەگەر تۆ کەسێکت بەڕاستی دەوێت لە ژیانتدا،
گوێ لە دەنگی دڵت بگرە نەک دەنگی هەموو کەسانی چواردەورت...!

***

{٣٢٧}

ئەوەت خۆشبووێت کە دڵت دەیەوێت نەک چاوەکانت، نیگەرانی کەسانی تر مە بە کە چۆن بیردەکەنەوە یاخود چی دەڵێن، چونکە ئەوە خۆشەویستی تۆیە نەک ئەوان...!

***

## (خودامان بەسە!)

{٣٢٨}

خودا هەنگاوەکەت لەبیر ناکات کە بۆ چاککردنەوەی خەڵکی ناوتە، لەکاتێکدا خۆت نوقوم بوویت لە ناو خەم ...!

***

{٣٢٩}

هێندەی ژمـارەی مرۆڤەکان ڕێگە هەیە بۆ گەیشتن بە خودا...!

***

{٣٣٠}

ئەوەی لە دەریای دەرد و بەڵای دونیادا پشتی بە خوا قایم بێت، منەتی کەشتی و کەشتیوان هەڵناگرێت...!

"مەحوی"

***

## (بابەخشین!)

{٣٣١}

باشترین دیاری بۆ بەخشین:
بۆ هاوڕێیەکەت، وەفادارییە.
بۆ دوژمنەکەت، لێخۆشبوونە.
بۆ سەرۆکەکەت، خزمەتکردنە.
بۆ منداڵەکەت، نمونەیەکی باشە.
بۆ دایک و باوکت، دڵسۆزی و سوپاسگوزارییە.
بۆ هاوژینەکەت، خۆشەویستی و متمانەیە.
بۆ هەموو ژن و پیاوێک، چاکەیە.

"ئۆرێن ئارنۆڵد"

***

{٣٣٢}

مەزنەکان ئەوانەن کە دەبەخشن و لەبیردەکەن، وەردەگرن بە بێ ئەوەی لەبیری بکەن...!

***

## (ناتوانین ڕابردوو بسڕینەوە!)

{٣٣٣}

ناتوانیت ڕابـردووت بگۆڕیت، ناتوانیت پێشبینی داهاتوو بکەیت، بەڵام دەتوانیت ئێستات تێکبدەیت بە بیرکردنەوە لەم دووانە...!

***

{٣٣٤}

ئێمە خۆمان ڕابردوومـان دروسـت کـردوە، بـەڵام مانای ئەوەنیە کە ببین بە بەندکراوی ئەو..!

"ڕیک وارن"

***

{٣٣٥}

ڕابـردوو قەڵغانی منە کە ناتوانم لای ببەم، گرنگ نیە تۆ چەندین جار پێم بڵێیت کە جەنگ کۆتایی هاتووە...!

***

{٢٣٦}

وَلاَ تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلاَ ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِىٌّ حَمِيمٌ (فصلت: ٣٤)

بێگومان چاکە و خراپە وەک یەک نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بەجوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بکە، ئەو کاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەک هەیە؛ دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی.

{٣٣٧}

پێویستە ئێمە هەرگیز متمانە بە مرۆڤایەتی لەدەست نەدەین، چونکە مرۆڤایەتی وەکو دەریا وایە؛ئەگەر چەند دڵۆپەیەک لە دەریا پیس بوو مانای ئەوەنیە کە دەریا پیس بووە...!

"گاندی"

***

{٣٣٨}

کاتێک خاوەنی چاوی ئەرێنیت ئەوا جیهانت خۆشدەوێت، بەڵام ئەگەر زمانت ئەرێنی بێت ئەوا جیهان تۆی خۆشدەوێت!

***

{٣٣٩}

ئەگەر شتەکان بە خراپی ڕۆیشتن، تۆ لەگەڵیان مەڕۆ...!

"ڕۆگێر بابسەن"

***

# (بەهێزترین چەکی بەختەوەری...)

{٣٤٠}

نەرم و نیانی داوێکە هەموو دوژمنێک ڕاودەکات...!

"مەلاعبدولکریم مودەڕیس"

***

{٣٤١}

بەهێزترین چەکی بەختەوەری ئارامگرتنە، هەورەکانیش وەرزێکیان پێ دەچێت هەتا دەبنە باران...!

***

{٣٤٢}

ببە بە ڕووناکی لە ناو تارییکیەکان،
ببە بە ئارامی لە ناو زریـانەکـان،
ببە بە ئاشتی لە کاتـی جەنگدا...!

"مـایک دۆلان"

***

## (هیچ کارێکی چاک بە کەم سەیر مەکە)

{٣٤٣}

واتە: (هیچ کارێکی چاک بە کەم و بێ بایەخ سەیر مەکە، ئەگەر ئـەوەش بێت کە بە ڕوویـەکی خـۆش و کـراوە ڕووبەڕووی برایەکت بووەستی).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

***

{٣٤٤}

ئەگەر شادی و خۆشییەک بچێتە دڵی مرۆڤەوە، پاداشتی ئـەوەیـە کە کەسێکی دڵخۆش و دڵشـادکـردووە، ئەگەر غەمگینیش بێت، ئەوا کەسێکی غەمگین کردووە.

ئەمە خەڵاتەکانی ئەم دنیایەیە، کە هێڵکاری و پیشاندەری ڕۆژی پاداشتە، تاوەکو بەم کەمە ئەو زۆرە تێبگەن، هەروەک مشتێک گەنم نمونەی خەرمانێکە.

"مەولانای ڕۆمی"

***

## (پارە گرنگە، بەڵام هەموو شتێک نییە!)

{٣٤٥}

گەر دەتەوێت هەست بە دەوڵەمەندی بکەیت،
تەنها ئەوشتانەت بژمێرە کە پارە ناتوانێت بیکڕێت!

***

{٣٤٦}

سەرکەوتن ئەوەنییە کە تۆ چەندە پارە بەدەست بهێنیت، بەڵکوو سەرکەوتن ئەو جیاوازیەیە کە تۆ لە ژیانی کەسانی تر دا دروستی دەکەیت!
"میشێل ئۆباما"

***

{٣٤٧}

ئەگەر تۆ جدی نەبیت لەگەڵ پارەکانت، ئەوا هەرگیز بەجدی پارەت نابێت...!
"گرانت کاردۆن"

***

## (لەهەر شوێنێکیت ببە بە خۆری ئەو شوێنە!)

{٣٤٨}

بڕوام پێبکەن،

هەمووتـــان،

باشترین چاکە و یارمەتیەک کە بتوانین پێشکەش بەو شوێنەی بکەین کە تیایدا دەژین، ئەوەیە کە دڵخۆشبین تیایدا....!

"ئیدیز وارتۆن"

***

{٣٤٩}

ئەگەر تۆ ڕووناکیت دەوێت لە ژیانتدا، پێویستە لەو شوێنە ڕابوەستیت کە دەدرەوشێـــتەوە!

***

{٣٥٠}

ئەگەر نەزانیت بۆ کوێ دەڕۆیت،

دڵنیابە بە هیچ کوێ ناگەیت!

***

## بێدەنگی مانای زۆر دەبەخشێت!

{٣٥١}

ئەگەر قسەکردن یەک مانا ببەخشێت ئەوا بێ
دەنگی هەزار و یەک.
هەموو کەسێک قسەی لەدەست دێ.
بەڵام بێدەنگی؛ تەنها لای بەهەستەکان سەوز دەبێت..
"مەولانای ڕۆمی"

***

{٣٥٢}

بێدەنگی مانای ڕازی بوون نیە بەردەوام
هەندێجار واتا ئێمە ماندوو بوین
لە شیکردنەوە بۆ کەسانێک کە تێناگەن..!

***

{٣٥٣}

پێویست ناکات هاوار بکەیت،
ئەوەی لێت تێدەگات بەباشی گوێی لە بێ دەنگیتە...!
"جبران خلیل جبران"

***

# (ماناى چاكه و خراپه چييه؟)

{٣٦٧}

(چاكە واتا جوانی ڕەوشت، خراپە واتا ئەو شتەی کە لە دڵت دا خوت خوتە بکات و پێت ناخوش بێت کە خەڵک پێی بزانن).

"پێغەمبەر موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)"

** **

{٣٦٨}

هەتا ئەگەر ژیان سەخت بوو بۆت،
بزانەکە خودا هیچ ئەرکێک ناخاتە سەر شانی کەسێک کە لە توانایدا نەبێت...!

***

## (سووربە لەسەر بەدیهێنانی ئاواتەکانت!)

{٣٦٩}

سووربە لە بەدەست هێنانی ئەو هیواو ئاواتەی کە خۆت داتناوە لە ناو مێشــکی خــۆت!

***

{٣٧٠}

بۆ هەموو ژیانت، ئەگەر بتەوێت سەرکەوتوبیت دەبێت ئەوەت بیربێت کە بەبێ ئازار نابێت، بەبێ ناڕەحەتی نابێت، بۆ ئەوەی خەون بهێنێتە دی دەبێت خۆت لە خەو بکەیت...!

***

{٣٧١}

قــەبارەی دونیای هـەرکـەس، بــە ڕادەی بیــر کردنــەوەی خــۆیەتــی!

"موحەممەد حیجازی"

***

## (بەباشی بیربکەوە!)

{٣٧٢}

بیربکەوە بەر لەوەی قسە بکەی،
بخوێنەوە بەر لەوەی بیربکەیتەوە...!

***

{٣٧٣}

تۆ تەنها بەرپرسی ژیـــانی خۆتی،
نـــەک پاسەوانـــی ئەخلاق و ژیـــانی خەڵک!
"تـەنیـــا موحەممەد"

***

{٣٧٤}

کاتی خۆت بەفیڕۆمەدە بە ڕوونکردنەوە، خەڵکی تەنیا ئەوە دەبیستن کە خۆیان دەیانەوێت!
"پاولۆ کۆیلۆ"

***

## (هەڵەکردن=فێربوون!)

{٣٧٥}

دڵت بتکێنە،
هەڵەکانت کاتێ دەکەونە سەر زەوی بهێڵە هەر لەوێ بمێنەوە تەنها لە نێوان هەڵەکانت،
یەک تەجروبە دەربهێنە لەنێو چوار چێوەیەک دایبنێ و بیدە لە دیواری دڵت.
هەڵە کردن خراپ نییە بەڵکو لەناو هەڵە مانەوە خراپە!
"فروغ فروخزاد"

***

{٣٧٦}

من مرۆڤم،
ئەگەر هەڵەنەکەم هەرگیز فێرنابم،
مرۆڤ تەنها لەڕێگەی هەڵەکانیەوە بەرەو پێش دەچێت!
"ئەلێکسەندەر ئێمسی"

***

## (دڵشکاوبە، دڵشکێن مەبە!)

{٣٧٧}

ئەوەندە ورد دەبینەوە لە خەڵک و دەیانخەینە ژێر مایکرۆسکۆپەوە، خۆزگە ئەوەندەش وردبووینایەوە لە خودو ناخی خۆمان، ئەوسا کاتمان نەدەما بۆ وردبوونەوە لە ژیانی کەس!

"م. شەماڵ موفتی"

***

{٣٧٨}

ئازاردانی کەسێک بە ئەندازەی هاویشتنی بەرد بۆ ناو دەریا ئاسانە، بەڵام هەرگیز نازانیت ئەو بەردە چەندە دەچێتە قوڵاییەوە!

***

{٣٧٩}

تاکە شتێک کە شایەنی دڵتەنگی بێت تاوان و ئەو خراپەکاریانەیە کە بەرامبەر خەڵکی دەیکەیت...!

***

## (ژیان بەبێ بوونی خۆشەویستی نایێت!)

{٣٨٠}

ژیان فێری خۆشەویستیت دەکات،
ئەزموونەکان فێرت دەکەن کێت خۆشبوێت،
بارودۆخەکان فێرت دەکەن کێ تۆی خۆش دەوێت!
"نزار قەبانی"

***

{٣٨١}

مردن ئازارێک دروست دەکات هیچ شتێک ناتوانێت چاکی بکاتەوە، خۆشەویستی یادگاری وا جێدەهێڵێت هیچ کەسێک ناتوانێت بیدزێت!

"هێئەدستۆن"

***

{٣٨٢}

ڕەنگە توانای ئەوەت نەبێت کە خەڵکی ناچار بکەیت بۆ ئەوەی خۆشیان بوێیت، بەڵام دەتوانی ناچاریان بکەیت بۆ ئەوەی ڕێزت لێبگرن!

"ئیبراهیم فەقێ"

***

## (لەکۆتایدا سوپاسگوزاربە...)

{٣٨٣}

بەختەوەری ئەو کاتە دێتە ڕێگامان کە بوەستین لە ناڕەزای دەربڕین لەو کێشانەی هەمانە، لەبری ئەوە سوپاس گوزاری دەرببڕین بۆ ئەو کێشانەی کە نیمانە!

***

{٣٨٤}

سوپاسگوزاربە بۆ هەموو شتە گەورە و بچوکەکانی ژیانت، بۆ هەموو ئەوشتانەی لە نێوانیان دایە..!

***

{٣٨٥}

سوپاسگوزاری بەرەوپێشچوونەکانت بە وەک ئەوەی تۆیان بەرزکردۆتەوە بۆ ئاستێکی بەرزتر، سوپاسگوزاری شکستەکانیشت بە چونکە ئێستا تۆ چیرۆکێکت هەیە بۆ باسکردن!

***

## (بەڵێ، سوپاسگوزاربە...)

{٣٨٦}

سوپاسگوزاربە بۆ هەموو ئەو شتانەی ئەمڕۆ لە ژیانتا بوونیان هەیە، لەوانەیە سبەی ئەو شتانەت نەبێت!

***

{٣٨٧}

گرنگ نییە چەندە باش، یاخود خراپە ئەوەی کە لە ژیانتا بوونی هەیە، هەموو بەیانیەک بە سوپاسگوزارییەوە لە خەو هەستە.

کەسانێک لە شوێنێک لە شوێنەکان بە ناچارییەوە دەجەنگن بۆ ژیانیان...!

***

{٣٨٨}

هیچ کەسێک بەختەوەرتر نیە لە مرۆڤی سوپاسگوزار، مرۆڤی قایل و ئاسوودە...!

***

## (بەردەوام بۆ خۆتی دووپاتبکەوە!)

*من ڕووبەڕووی ڕاستیەکان دەبمەوە وە ئەوە قبوڵ دەکەم که ناتوانم بیگۆڕم.

*من شایەنی ئەوەم کە سەرکەوتوو و دڵخۆشبم.

*من خاوەنی شتانێکی زۆرم کە شایستەی سوپاس گوزارین.

*من جوانی دەبینم لەو شوێنانەش کە کەسانی تر ناتوانن ببینن.

*من متمانەم بەوەهەیە کە دەتوانم هەر شتێک بەدەست بهێنم کە دەیخەمە مێشکمەوە.

*من ئەوەم هەڵبژاردووە کە سەرنج بخەمە سەر شتە ئەرێنیەکان لە جیاتی نەرێنیەکان.

***

## (هەست بە هێزی وشەکان بکە!)

*من بەهێزترم لە هەموو ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووم دەبێتەوە.

*هیچ شتێک ناتوانێت من بوەستێنێت لە سەرکەوتن.

*من لە ئاشتیدام لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە ڕوودەدات.
*ژیانم دیارییەکە، منیش هەموو ئەوشتانە بەرز دەنرخێنم کە هەمە.

*من بەختەوەری و تەندروستی هەڵدەبژێرم بۆ ژیانم.
*گرنگیدان بە خودی خۆم بەشێکە لە بەرپرسیاریەتیم.

***

سوربە لەسەر **بەدەستهێنانی** ئەو شتانەی کە سوودت پێ دەگەیەنێت.
پێغەمبەر موحەممەدﷺ

**دوو تایبەترین ڕۆژەکانی ژیانت**، ئەو ڕۆژەی کە لە دایکبوویت وە ئەو ڕۆژەی کە دەزانی بۆچی لە دایکبوویت !!
مارک توەین

زۆرێک لە **باشترین ڕۆژەکـــانی ژیـــانت** هێشتـــا ڕووی نەداوە، بۆیە بەردەوام بــــە...!

**سوپاسگوزاربە** بۆ هەموو ئەو شتانەی ئەمڕۆ لە ژیانتا بوونیان هەیە، لەوانەیە سبەی ئەو شتانەت نەبێت...!

**گرنگ نیە** کە تۆ پێتوایە چەندە سەرقاڵیت، پێویستە کاتێک تەرخان بکەیت بۆ **خوێندنەوە**. ئەگەرنا خۆت بەدەستەوە بدە بۆ ئەوەی کە تۆ "نەزانیت"هەڵبژاردووە...!

کتێبخانەی **گۆڵدن بووک**
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Goldenbook ktebfroshe_warzer




**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel

**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون " ئاڤان بەهجەت " کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link